دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

● **شەکسپیر: تراژیدیا و بەهلول** (کۆمەڵە لێکۆڵینەوەیەکی وەرگێڕدراو)

● **وەرگێڕان و ئامادەکردن:** د. هیمداد عەبدولقەهار محەمەد

● **نەخشەسازی ناوەوە:** ڕێدار جەعفەر — ئالان دیلۆن

● **بەرگ:** هۆگر سەدیق

● **ژمارەی سپاردن:** (٤٦٠) لەساڵی ٢٠١١

● **نرخ:** (١٥٠٠) دینار

● **چاپی یەکەم:** ٢٠١١

● **تیراژ**(٥٠٠) دانە

● **چاپ:** چاپخانەی ڕۆژهەڵات (هەولێر)

**زنجیرەی کتێب (٥٦٧)**



**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com
**ئیمەیل:** info@mukiryani.com



# ناوەڕۆك

**پێشەکی .......... ٧**
شەکسپیر: ژیان و بەرهەمەکانی .......... ٩
بەهلول لە شانۆنامەکانی شەکسپیردا (*) .......... ٢٥
تێڕامانێك لە بەهلوولەکانی شەکسپیر و سەیدەی تەڵعەت سامان.......... ٣٧
شەکسپیر و هونەری بیستن میتافۆری ((گوێ)) لە ((ئۆتێللۆ))دا .......... ٤٩
بونیادی درامی یۆلیۆس قەیسەری شەکسپیر .......... ٦١
((شالیر))ی شەکسپیر: هەڵسەنگاندنێك .......... ٧٣
سروشت و گاریگەریی ((گەرداوەکە))ی شەکسپیر .......... ٨٣
کۆمپیوتەرو.......... ٩٣

# پێشەكی

بێگومان هەموو مرۆڤێك دەتوانێ بە پێی توانا بڕیار بدات لەسەر ئەو بابەت و بەرهەمانەی دەیەوێ رۆژێك لە ڕۆژان بیانخوێنێتەوە بۆ ئەوەی هەم سوود و هەموو چێژییان لێوەر بگرێ. بەلاّم هەندێ بەرهەم و نووسین هەن هێندە پڕبایەخ و بە سوودن پێویست بە بیركردنەوە و بڕیاردان ناكەن.یەكێك لەم بەرهەمانە بریتین لە بەرهەم و نووسینەكانی ولیەم شەكسپیری گەورە شانۆنوس وشاعیری بەناوبانگی ئینگلیزی بە تایبەتیش شانۆنامەكانی كە ئێستا بوونەتە موڵكی هەموو مرۆڤایەتی و وەرگێڕدراونەتە زۆرێك لە زمانەكانی دونیا.

لەم ڕوانگەیەوە كتێبخانەی كوردی تاڕادەیەك بێ بەش بووە لەم شاكار و بەرهەمانە هەرچەندە هەندێكیان وەرگێڕدراون بەلاّم بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن كەچی شەكسپیر نزیكەی چل شانۆنامەی نووسیوە.ئەوەی لە خودی بەرهەمەكانیش گرنترە ئە لێكۆڵینەوە و لێكدانەوانەن كە بۆ بەرهەمەكانی كراون و لەبارەیانەوە نووسراون.بە درێژایی چەند سەدە بەرهەمەكانی شەكسپیر بە بەردەوامی شتیان لەبارەیەوە نوسراوە و لێكداوەی تاوەیان بۆ كراوە.هەر گەل و نەتەوەیەك بە پێی سەردەمی خۆی و بارودۆخی خۆی بەرهەمەكانی شەكسپیریان لێكداوەتەوە و پەند و ئامۆژگاری و داهێنانەكانیان زەق كردۆتەوە و ئەوانەشیان بە خوێنەرانی خۆیان گەیاندووە.

لەم ڕووەوە بە بۆچوونی من خوێنەری كورد زۆر كەم ئاشنایەتی لەگەڵ ئەو لێكدانەوە و ڕاڤەكردنانەی بەرهەمەكانی شەكسپیر هەیە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ چەند

هۆکارێك کە گرنگترینیان بریتیە لە بەربەستی زمان هەر بۆیە بیرم کردەوە لە وەرگێڕانی چەند لێکۆڵینەوە و لێکدانەوە و بابەتێکی ئەدەبی لەبارەی بەرهەمە جیاجیاکانی شەکسپیر بۆ ئەوەی مشتێك لە خەرواری شەکسپیر بخەینە بەر دیدە و هزری خوێنەری کورد و خزمەتێك بە خوێنەر بکەین بە پێی توانای خۆمان،هیوادارم ئەم کتێبە کەلێنێکی بچووك لە کتێبخانەی کوردیدا پڕ بکاتەوە.

**د.هیمداد عبدالقهار محمد**
**هەولێر / ئایار ٢٠١٠**



## شەکسپیر: ژیان و بەرهەمەکانی

ولیەم شەکسپیر ، شاعیر و شانۆنووس و ئەکتەری بەناوبانگی ئینگلیزی، زۆرجار وەکو مەزنترین نووسەری ئینگلیزی و یەکێك لە هەرە ناودارترین شانۆنوسەکانی دونیا ئاماژەی بۆ دەکرێ.زۆرجاریش وەکو شاعیرێکی نشتیمانی ناوزەد دەکرێ.

ولیەم شەکسپیری کەڵە شاعیرو شانۆنامەنووس و ئەکتەری بلیمەتی ئینگلیزی شارەکانی بوونەتە سامانی مرۆڤایەتی و هەتا هەتایە نەمریان بەو لوتکەیە بەخشیوە. ولیەم ریچارد شەکسپیر لە ساڵی ١٥٦٤ز لە شاری ستراتفۆرد لە ئینگلتەرە لە دایك بووەو لە ساڵی ١٦١٦ز ماڵئاوایی لە دونیای ئەلیزابێتی و دونیای ئەدەب کردووە. لەبەر ئەوەی تا ئێستا ژمارەی تەواوی بەرهەمەکانی ساغ نەبۆتەوە، بۆیە تەنها پەنجە بۆ ئەو بەرهەمانە درێژ دەکەم کە هیچ گفتوگۆیان لەسەر نییە و شەکسپیر بە تەنها نووسیوونی تێکرای ئەو بەرهەمانەش سی و حەوت شانۆنامەو سەدو پەنجا و چوار سۆنیات، هۆنراوەی چواردێری، ودوو پەخشانی درێژە. جگە لە کاری نووسین شەکسپیر کاری تریشی کردووە وەك ئەکتەری و بەشداریش بووە لە خاوەندارێتی کردنی شانۆی جیهان Globe Theater کە زۆربەی زۆری شانۆنامەکانی خۆی و نوسەرانی تری ئەو سەردەمی لەسەر نمایش کراوە.

شەکسپیر زۆربەی نووسینە بەناوبانگەکانی لە نێوان ساڵانی ١٥٩٨-١٦١٣ نووسیوە.بەرهەمەکانی سەرەتای بریتی بوون بەرهەمە کۆمیدی و مێژوویەکان ئەو ژانەرە ئەدەبیانەی کە شەکسپیر بەرەو ئاستێکی تری بردن لە کۆتاییەکانی سەدەی شازدەهەم.پاشان دەستی کرد بە نووسینی بەرهەمە تراژیدییەکان تاکو نزیکەی ١٦٠٨ وەکو هاملێت و شالیر و ماکبێس کە بە چەند بەرهەم و شاکارێکی زمان و ئەدەبی

ئینگلیزی دادنرێن.لە قۆناغی دوایی ژیانیدا دەستی کرد بە نووسینی تراژی-کۆمیدی و هەمئاهەنگی دەکرد لەگەڵ چەند شانۆنووسێکی تری ئەو سەردەمە.

زۆربەی شانۆنامەکانی بە چەند شێواز و بەرگ و چاپێکی جیاواز کۆکراونەتەوە و بە چاپ گەیەنراون بۆیە دەبینین زۆر جار هەموویان وەکو یەك نین و چەند جیاوازییەك لە نێوان تێکستەکان بەدی دەکرێن.

شەکسپیر لە رۆژگاری خۆیدا وەکو شاعیرێك و شانۆنوسێکی رێزدار سەیر دەکرا بەلاّم ناوبانگی تاکو سەدەی نۆزدەمیش نەگەیشتە ئاستی پێویستی خۆی . لە سەردەمی رۆمانتیسیزم بلیمەتی و لێهاتووی شەکسپیر ئاشکرا بوو و ڤیکتۆرییەکانیش شەکسپیرییان زۆر بە گەورە و پایە بەرز سەیر دەکرد.لە سەدەی بیستەمدا بەرهەمەکانی بەردەوام دبارە دەکرانەوە و بە هۆی بزوتنەوەی ئەدەبی جۆراوجۆر زیاتر شتی لێ دەدۆزرایەوە و بە شێوازی جیاجیا نمایش دەکران.تا ئەمڕۆش بەرهەمەکانی زۆر جەماوەر و خوێنەر وبینەریان هەیە و بەردەوام لێۆلینەوەیان لە بارەوە ئەنجام دەدرێ و شیکردنەوە و ڕاڤەی نۆییان بۆ دەکرێ لە سەرتاسەری دونیا.

سەبارەت بە ژیانی شەکسپیر ئەوا لە شوێنی جیاجیا بووە بەلاّم شوێنی لە دایك بوونی خۆی ستراتفۆرد و لەندەن دوو شوێنی سەرەکین.هەر لە تەمەنی ١٨ ساڵیدا شەکسپیر ژیانی هاوسەری پێك دەهێنێ لەگەڵ (ئان هاتەوەی) کە ئەم کات تەمەنی ٢٦ ساڵ بوو.شەکسپیر جگە لە نووسنی شانۆنامە و شیعر، ئەکتەریش بووە بە تایبەتیش لە بەرهەمەکانی خۆیدا رۆڵی بینیوە.چەند ساڵێك لە تەمەنی شەکسپیردا دیار نیە کە هەندێ لە لێکۆڵەرەوان پێیان وایە شەکسپیر بە هۆی کێشەیەك خۆی حەشار دابێ و شارەکەی خۆی بەجێ هێشتبێ.دوای گەڕانەوەشی بە گوڕ و تینێکی زۆرتر گەڕایەوە گۆڕەپانی ئەدوبی ئەو سەردەمە و دەستی کردەوە بە نووسین و رۆڵ بینین.ژیانی شەکسپیر بە تەواوی گۆڕا و تا ڕادەیەك دەوڵەمەند بوو تا وای لێهات توانی خانووی گەورە بکڕێ بۆ خانەوادەکەی و تەنانەت بەشێکی لە شانۆی گلۆب Globe Theatre کڕی کە زۆربەی بەرهەمەکانی ئەو کاتەی تێدا نمایش دەکرا وقازانجێکی باشی هەبوو.



## شانۆنامەکانی شەکسپیر:

زۆربەی شانۆنووسەکانی ئەو سەردەمە هەماهەنگیان دەکرد لەگەڵ یەکتردا لە یەکاری نووسین و ڕەخنەگران لەو باوەڕەدان شەکسپیریش ئەم کارە کرد بێ و بۆی کرابێ لە سەرەتا و کۆتایی کارەکانیدا.بەڵگەی نێو تێکستەکان ئەوە پشت ڕاست دەکەنەوە کە چەندین شانۆنامە پێداچوونەوەیان بۆ کراوە پاش ئەوەی نوسراون.

یەکەم بەرهەمی تۆمارکراوی شەکسپیر بریتیە لە شانۆنامەی( ریچاردی سێیەم) و سێ بەشی (هێنری پێنجەم) کە لە ساڵانی سەرەتاکانی ١٥٩٠ەکان نوسراون. دەست نیشانکردنی مێژووی شانۆنامەکانی شەکسپیر کارێکی زەحمەتە بەلاّم لێکۆڵینەوەی تێکستەکان ئەوە دەردەخەن کە شانۆنامەکانی (تیتۆس ئەندرنیکۆس) و ( کۆمیدیای هەڵەکان) و (ملکەچکردنی کێوی) و (دوو پیاوماقولەکەی ڤیرۆنا) دەگەڕێنەوە بۆ سەردەمی سەرەتای کاری شەکسپی

## سۆناتەکان:

سۆناتەکانی شەکسپیر لە ١٥٤ هۆنراوە پێکهاتوون کە هەموویان باس لە خۆشەویستی و جوانی و نەمریی دەکەن. زۆربەیان لە ساڵی ١٦٠٩ بلاّوکرانەوە تەنها دوو هۆنراوەیان نەبێ کە لە ساڵی ١٥٩٩ لە کتێبێکدا بلاّوکراوبوونەوە.ئەو سۆناتایانەیە لە ماوەی چەند ساڵێکدا نووسراون و ڕەنگە هەر لەسەرەتای ساڵانی ١٥٩٠ ەوە دەستی پێکردبێ.

## هۆنراوەی تر:

هەروەها شەکسپیر چەند هۆنراوەیەکی درێژی نووسیوە بەڵام ڕەنگە ئەمانە پیاهەڵدان و ستایشی ئەو کەسانە بن کە چاکەیان لەگەڵ شەکسپیردا کردووە چونکە لەو سەردەمەدا هۆنراوەی ستایش و پیاهەڵدانی کەسانی دەست ڕۆیشتوو و بەرچاو کارێکی زۆر باو بووە.لەگەڵ ئەمانەشدا شەکسپیر چەند هۆنراوەیەکی کورتیشی نووسیوە و زۆربەیان لە کتێبێکی کۆکراوەی هۆنراوەکای ئەو کاتە بەرچاو دەکەون.

## شێوازی نووسینی شەکسپیر:

بەرهەمەکانی شەکسپیر کاریگەرییەکی بنەڕەتیان هەبوو لەسەر شانۆی دوای خۆی.شەکسپیر شانۆی ئینگلیزی ئەو سەردەمەی فراوانترکرد لەڕووی پێشبینەکانی کە دەکرا بەدەست بهێنرێن لە رێگای کارەکتەر و نەخشە و ڕووداو و زمان و ژانەری ئەدەبیدا.هونەری شیعری شەکسپیر وایکرد پایەی شانۆی باو ئەو سەردەمە بەرزتر بێتەوە و سەرنجی رۆشنبیران و خەڵکی ئاسایی بەلای خۆیدا ڕاکێشا.

کاتێك شەکسپیر گەیشتە لەندەن لە کۆتایی هەشتاکانی سەدەی شادەهەم و سەرتای نەوەتەکانی ئەو سەدەیە شانۆ لە گۆڕاندا بوو. پێشتر باوترین ێوازەکانی شانۆی ئینگلیزی بریتی بوون لە شانۆ ئاکارییەکان ( morality plays).ئەم جۆرە شانۆیە تێکەڵەیەك بوو لە ئایین و کۆمیدیا کە تێیدا بەها ئەخلاقیەکان و ئاکارییەکان سیفەتی کەسییان پێدەدرا و لایەنە چاکەکان زەق دەکرانەوە و و هەردەم کەسایەتی سەرەکی شانۆییەکان دەبوو ژیانێکی ئایینی و لەخواترسانە هەڵبژێرن. کارەکتەر و بارودۆخەکانی هەموویان سیمبۆلی بوون نەك واقیعی و راستەقینە. وەك منداڵێك شەکسپیر ئەم جۆرە شانۆیەی بەرچاو کەوتووە هاوکات لەگەڵ شانۆی پەنهانی و موعجیزەیی ( mystery and miracle plays).لە هەمان کاتیشدا لە زانکۆکانی ئەو سەردەمە ، شانۆی ئەکادیمی لەسەر بنەمای دراما رۆمانیەکان نمایش دەکران.ئەو



شانۆیانە کە زۆربەی جار بە لاتینی نمایش دەکران شێوازێکی شیعریی ووردتر و پەختەتریان بەکاردەهێنا بە بەراورد لەگەڵ شانۆ ئاکارییەکان.بەڵام لە هەمان کاتدا زیاتر جێگیر بوو و وتەی درێژتریان پێی باشتر بوو لە جولەی جەستەیی.

لە کۆتاییەکانی سەدەی شازدەهەم شانۆی ئاکاریی و ئەکادیمی ڕوو لە کزی بوو و شانۆنووسەکانی وەکو تۆماس کید و کریستۆفەر مارلۆ دەستیان دایە شانۆییەکی تر بە تێکەڵکردنی دراما کۆنە ئاکارییەکان لەگەڵ شانی ئەکادیمی بەمەش شێوازێکی سێکولاری نوێیان هێنا کایەوە.ئەم جۆرە شانۆیە نوێیە لایەنی شیعریی تێدا زۆر بوو هەروەها فەلسەفەی قووڵی تێدا بەدی دەکرا. بە کورتی هەموو لایەن باشەکانی هەردوو جۆر و شێوازەکەی پێشووی تێدا بەرچاو دەکەوت. بەڵام زۆر تەمومژاویتر و ئاڵۆزتر بوو لە ڕووی واتا و کەمتر بایەخی بە شتە سیمبۆلیە ئاکارییەکان دەدا.

شەکسپیر ئەو گۆڕانکارییانە بردتە قۆناغێکی ترەوە بە دروستکردنی شانۆ وا کە نەك تەنها ئاستی سۆزیی لەگەڵ بینەردا پەرەپێدا بەڵکو گەیشتە دۆزینەوەی ئەو کەرەستە و بابەتانەی کە واتای مرۆڤ بوون دەبەخشن.

بۆیە دەبینین بۆچوونی شەکسپیر بۆ هەموو لایەنەکانی شانۆ هەر لەڕووی کارەکتەر و شێوازە و ژانەرە جیاجیا ئەدەبیەکانەوەی تایبەتین و لە هاوتەمەنەکانی خۆی ناچن و جیاوازییان هەیە بە جۆرێك وای کردووە کە شانۆنووس و نووسەیر بەناوبانگیش بە رێژکەی ئەودا بڕۆن و هەوڵ بدەن لاسایی بکەنەوە لە نووسیندا ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەرکەوتنە یەك لە دوای یەکانەی شەکسپیر لەو سەردەمەدا کە ئەمەش بووە هۆی دەوڵەمەند بوونی شەکسپیر و فەراهەمکردنی ژیانێکی خۆش بۆ خێزانەکەی.

ناوبانگی شەکسپیر هەر لەسەردەمی خۆیەوە دەستی پێکد بەڵام دوای مردنی و کۆکردنەوەی بەرهەمە شانۆییەکانی زۆر پتریش دەرکەوت چونکە وەك دەبینین تاکو ئەمرۆش بەرهەم شانۆییەکانی شەکسپیر بوونەتە هەوێن و ئیلهام بۆ شانۆنووس و رەخنەگر و لێکۆڵیرێکی زۆر لە سەرتاسەری جیهان.هەروەها بەرهەکانی وەرگێردراونەتە سەر زۆرێك لە

زمانەکانی دونیا و هەر گەڵ و نەتەوەیەك بە پێی خوایست و پێویستی خۆی سوودی لێوەرگرتووە و لێوەدەگرێ.

## هونەری تراژیدی لە دیدگەی شەکسپیرەوە:

شەکسپیر لە هەندێك لە تراژیدیەکانیدا زۆر ئازادانە مامەڵە لەگەڵ رووداوە مێژووییەکان دەکات، بەڵام لە هەندێ شانۆنامەی وەك (یۆلیۆس قەیسەر) و (ئەنتوانی و کلیوپاترا) زۆر پابەندە بە رووداوە مێژووییەکان. لە شانۆنامەی (شالیر)دا ئەوەندە لادان هەیە بەڕادەیەك چیرۆکە راستەقینەکە ناناسرێتەوە، بەڵام لە شانۆنامەی (یۆلیۆس قەیسەر) دا تەنها وردە گۆڕانکاری لە ڕووداوەکان کراوە لەگەڵ چەند زیادکردنێك، ئەگەر بەوردی بڕوانینە نەخشەی بنەڕەتی هەردوو شانۆنامەکە بێگومان خاڵی هاوبەش لە نێوانیان بەدی دەکرێت و نەخشەی شەکسپیر هەموویان دیراسەی کارەکتەرن، بە تایبەتی کارەکتەرێکی گرنگ و سەرەکی کە ناوەکەی دەبێتە ناونیشانی شانۆنامەکە، هەرچەندە لە شانۆنامەی (ئۆتێللۆ) دا کارەکتەرێکی وەك ئیاگۆ(Iago) رۆڵێکی سەرەکی و گرنگ دەگێڕێت، بەڵام شانۆنامەکە تایبەتە بە بەسەرهاتەکانی کارەکتەری ئۆتێللۆ (Othello)، هەروەها لە شانۆنامەی (ماکبێت) و (شالیر) کارەکتەری وەك خاتوو ماکبێت (Lady Macbeth) و کۆردێلا (Cordelia) ڕۆڵی سەرەکیان پێبەخشراوە ئەوان لێپرسراوی ڕووداوەکانن و بایەخیان دراوەتێ، بەڵام دەبێ ئەوە لە یاد نەکەین کە هەردووکیان تەنها بۆ ماوەیەکی دیاریکراو ڕۆڵی سەرەکی دەبینن و دواتر لە شانۆنامەکە وون دەبن، بەرادەیەك نزیکەی لە سێیەکی شانۆنامەکە نابینرێن، ئەمەش بۆ ئەوەی لە بەها و گرنگی پاڵەوانی سەرەکی کەم نەکەنەوە بە شێوەیەکی گشتی تراژیدیاکانی شەکسپیر بریتین لە چەند ڕێگەیەك کە پاڵەوانی سەرەکی لە ژیانیدا دەیانگرێتەبەر تێیاندا سەرکەوتوو نابێت و دەر ئەنجامەکەشی کارەسات و مردنە، لە هەموو تراژیدیاکاندا واتایەکی بەهێزی چارەنووس (Destiny) بەدی



دەکرێت، بۆیە دەتوانین بە دڵنیاییەوە بڵێین شەکسپیر تێڕاونینێکی قەدەری(fatalistic) هەبووە بەرامبەر بە ژیان کە تێیدا مرۆڤ بە هۆی چەند هێزێکی دەرەکی و چەند هێزێکی بەرگەنەگیراوە لە ناو دەبرێت.

ئەو هۆکارەی دوایی وای لە هەندێك کەس کردووە بگەنە ئەو ئەنجامەی کە تراژیدیاکانی شەکسپیر بخەینە ریزی بەرهەمەکانی درامانووسە گریکییەکان کە پێیان وابوو پاڵەوانی تراژیدیای گریکی مرۆڤێکی باش- رەفتار و بێگوناه و بێ هەڵەبێت، زیاتریش پاڵەوانی تراژیدیای گریکی مرۆڤێکی بێ لۆمەیە، لێرەدا پرسیارێك دێتە کایەوە، ئایا دەتوانین تراژیدیاکانی شەکسپیر لە ریزی تراژیدیای گریکی دابنێین؟ وەڵامی ئەم پرسیارە دەبێ بە نەخێر بدرێتەوە، چونکە دوو خاڵی گرنگی جیاکەرەوە هەیە لە نێوان هەردوو جۆری تراژیدیادا. خاڵی یەکەم ئەوەیە کە پاڵەوانی تراژیدیای شەکسپیر کەسانی بێ لۆمە نین، بەڵکو لە هەر یەکێکیان پاڵەوان خاڵێکی لاواز و چارەنووسساز لە کەسایەتیدا پیشان دەدرێت، هەر ئەم خاڵە لاوازەش دەبێتە هۆی سەرەکی کارەسات و دواتریش مردنی پاڵەوان خاڵی جیاکەرەوەی دووەم ئەوەیە کە پاڵەوانی تراژیدیاکانی شەکسپیر، جیا لە تراژیدیای گریکی، یەك هەلی بۆ دەرەخسێت کە ئەگەری دەربازبوونی لێدەکرێت، بەڵام پاڵەوان بەدبەختانە ئەو هەڵە ناقۆزێتەوەو دوای ئەوەش چارەنووسی حەتمی پاڵەوان دێتە بوون، ئەم ڕاستییە زۆر بە ئاشکرایی لە شانۆنامەی (ماکبێت) بەرچاو دەکەوێت، لەو کاتەی کە ماکبێت (Macbeth) بەردەوام بیرۆکەی کوشتنی پاشا دەنکان(King Duncan) لە مێشکیدا دەخولێتەوە، پاشا زۆر دڵخۆشە بە هەوڵی ئازایەتی و دڵسۆزی ماکبێت لە بەرەکانی جەنگدا، لە هەمان کاتدا ماکبێت بیری لەو وشە جوانانە دەکردەوە کە پاشا دوای گەڕانەوە بەسەر کەوتوویی ماکبێتی پێ وەسف کردو بیری لەو سروشتە پاك و بێگەردەی پاشا دەکردەوە کە ماکبێت پیلانی بۆ لە ناوبردنی کێشا بوو، فریشتەی چاکە لەسەر شانی داوای وازهێنان لەم پیلانەی لێدەکرد بۆیە بۆ ماوەیەك ماکبێت بیری لە

دەست هەڵگرتن لە بیرۆکەی کوشتنی پاشا دەکردەوەو خەریك بوو زاڵ بێت بەسەر لایەنی خراپی کەسایەتی خۆی، بەڵام لەو کاتەدا خاتوو ماکبێت دەستی کرد بە بەکارهێنانی هەموو توانای بۆ هاندانی ماکبێت بۆ ئەوەی دووبارە بیرۆکەی کوشتنی پاشا بخاتەوە مێشکی و لەمەشدا سەرکەوتوو بوو، ماکبێت دووبارە دەست دەکاتەوە بە بیرکردنەوە لە کوشتنی پاشا. ماکبێت بڕیاری داو ڕێگەیەکی هەڵبژارد و تا کۆتایی پێوەی خەریك دەبێت، بە هەمان شێوە لیر (Lear) لە شانۆنامەی (شالیر) هەڵی هەلبژاردنی ڕاست و چەوتی بۆ دەرەخسێت، بەڵام ئەویش ڕێگە چەوتەکە هەلدەبژێرێت.

بەم شێوەیە دەبینین پاڵەوانی تراژیدیا پیاوێکی باش- رەفتارو پایەبەرزە لە کۆمەڵدا، چونکە شەکسپیر هەرگیز پاڵەوانەکانی لە چینی خوارەوەی کۆمەڵ هەڵنەبژاردووە، ئەم پاڵەوانە تراژیدییە یەك خاڵی لاواز لە کەسایەتیدا بەدی دەکرێت، لە بەدبەختی پاڵەوان ڕووداوەکان وا ڕێکخراون کە ئەم خاڵە لاوازە دەبێتە هۆی بنەڕەتی کارەسات و مردنی پاڵەوان، بۆ نموونە دەبینین ئۆتێللۆ (othello) حەسوودە، سەرەڕای ئەوەی چەند سیفەتێکی چاکی وەك ئازایەتی و باش رەفتاری تێدا بەدی دەکرێ، بەڵام زانیاری لەسەر ژیان کەمە بۆیە ناتوانێت سەرکەوتووانە کەسانی دەوروبەری بخوێنێتەوە ئوتێللۆ دەتوانێت بە ئاسانی جەنگ لە بەرژەوەندی خۆی کۆتایی پێ بێنێت، بەڵام هەرچەندە هەندێك گومان پەیدا دەکات کاتێك ئیاگۆ درۆ هەڵبەستراوەکانی بە گوێیدا دەچرپێنێت، ئوتێللۆ وەك منداڵ گوێی بۆ شل دەکات ئەو خاڵە لاوازەی کەسایەتی ئۆتێللۆ پەیوەستە بە ڕۆشنبیری و زانیاری لەسەر ژیان، بەدبەختانە هەموو هێرش و هەرەشەکانی چارەنووس ئاڕاستەی ئەو خاڵە لاوازە کراون، دەبێ ئەوەش بزانین کێشەی پاڵەوانێکی تراژیدی نابێتە کێشەی هەموو پاڵەوانەکانی دی، هاملێت (Hamlet) نەیدەتوانی چارەسەری گومانەکانی خۆی بکات، بەڵام هێزو توانایەکی فیکری جیاکەرەوەی کەسانی دەوروبەری



باشی هەبوو، ئەم ڕاستییەش لە مامەڵەکردنی لەگەڵ کەسانی دەوروبەری بەزەقی بەرچاو دەکەوێت، هاملێت دەیتوانی زۆر بە ئاسانی درۆیەکانی ئیاگۆ سپی بکاتەوە، لەلایەکی دی (لیر) سەرەڕای خاڵە لاوازەکەی دەیتوانی کێشەی گومانەکانی هاملێت چارەسەر بکات، بەڵام لیر نەیدەتوانی کێشە دیاریکراوەکەی خۆی چارەسەر بکات، شایەنی باسە شانۆنامەی (شالیر)یش هەمان نەخشەی شانۆنامەکانی دی هەیە. واتە پاڵەوان کە دەکاتە ( لیر) خاڵێکی لاواز لە کەسایەتی پیشان دراوە، لیر سەرکەوتوو نابێ لە حوکمدان لەسەر کچەکانی خۆی گۆنریل (Goneril) و ڕێگان (Regan) و کۆریلا (Cordelia) بەجۆرێك بە تەواوی ڕاستیەکانی پێچەوانە دەکاتەوە، ئەمەش لەلای هەندێك خوێنەر بە هەڵەی بنەڕەتی دەژمێردرێت، بەڵام هەندێکی دی پێیان وایە کە کەللەڕەقی لیر لەم شانۆنامەیە وەك بنەڕەتیترین خاڵی لاوازە لە کەسایەتیدا مامەڵەی لەگەڵ کراوە، هەموو پاڵەوانە تراژیدییەکان وەك باڵندەی ناو تۆڕی ڕاوچی دێنە بەرچاو.

من لەو باوەڕەدام بیرۆکەی ڕاوکردنی باڵادەست و پایە بەرز لەلایەن چارەنووسەوە وای لە شەکسپیر کردووە بیرۆکەی سەرەکی شانۆنامەی (شالیر) هەلبژێرێت، دەبێ ئەوەش لە یادنەکەین کە شەکسپیر چەند شانۆنامەیەکی سەرکەوتووی لەسەر ئەم بیرۆکەیە واتە بیرۆکەی ململانێی نێوان مرۆڤ و چارەنووس نووسیوە، شەکسپیر پێی وایە دەبێ نووسەر زۆر بە وردی شارەزای چێژی خەڵکی بێت و لە بەرهەمەکانیدا هەڵی پێکانیان بدات، من پێم وایە سەرکەوتوویی شانۆنامەی (یۆلیۆس قەیسەر) هانی شەکسپیری داوە بۆ نووسینی شانۆنامەی (ئەنتۆنی و کیلۆپاترا) و ئەمەش بووە هۆی دەستپێکی بیرکردنەوە لە نووسینی چوار تراژیدیا مەزنەکەی کە لە هەموویاندا ئەکتەری بە ناوبانگی ئەو سەردەمە بۆربەیج (Burbage) ڕۆڵی پاڵەوانی شانۆنامەکانی گێڕاوە، بۆیە پێویست ناکات واتێبگەین کە ئەو دوو تراژیدیا ڕۆمانییەی لەسەرەوە ئاماژەی بۆ کرا، لەگەل چوار تراژیدیا مەزنەکە واتە (هاملێت) و

(شالیر) و (تۆتێللۆ) و (ماکبێت) لەسەر هەمان هێل و نەخشە دارێژراون و تێیاندا کەسێکی سەرەکی و لە ناوچوونی بە هۆی خاڵی لاواز لە کەسایەتیدا بەدی دەکرێت لەبەر ئەوەی ئەمە بیروبۆچوونی شەکسپیرە لەمەڕ تراژیدیا، چونکە چەندین لێکدانەوەو دیدو بۆچوونی دی هەیە ئەم راستیە روونتربکەنەوە.

بێگومان تراژیدیا و کۆمیدیا لە زۆر ڕووەوە لە یەکتر جیاوازن. شەکسپیر باوەڕێکی پتەوی بە عەداڵەتی شیعری (Poetic justice) هەیە واتە لە کۆتایی شانۆنامەدا چاك پاداشت بکرێ و خراپ سزا بدرێ، بۆ نموونە رۆزالیند (Rosalind) لە شانۆنامەی (چۆن حەزدەکەی) و بەسانیۆ (Bassanio) لە شانۆنامەی (بازرگانی ڤینس) لە کۆتاییدا پاداشتی خۆیان وەردەگرن و دواتر بەخۆشی و سەرفرازی ژیان دەبەنەسەر، کەچی شایلۆك (Shylock) لە شانۆنامەی (بازرگانی ڤینس) سزا دەدرێت هەرچەندە سزایەکەی بەو جۆرە نەبوو کە خوێنەر یان بینەر چاوەڕێی دەکرد، بە شێوەیەکی گشتی لە کۆمیدیادا ژیان وەك شتێکی بەبەزەیی دەبینرێ و پاك و بێگەرد دێتە بەرچاو، بەڵام لە تراژیدیا ئەمە بەرچاو ناکەوێت، چونکە تێیاندا گوناهبار و بێ گوناه بەیەکەوە دەبنە قوربانی ئەو کارەساتەی بەهۆی هەڵەو خاڵە لاوازە دیاریکراوەکەی پاڵەوان دێتە کایەوە، باش- رەفتاری و راستگۆیی و داوێن پاکی نابێتە هۆی رزگارکردنی کۆردیلا و دیسدەمۆنا.

وا پێدەچێ هیچ هێزێکی بە توانا نەبێت کە مرۆڤی باش — رەفتار بپارێزێت و بەد رەفتاریش لەناو ببات، ئەو چارەنووسەی ئێمەی خوێنەر لە شانۆنامەی (شالیر)دا بەدی دەکەین پارێزەری هیچ کەسێك نییە.

سەرەڕای ئەو راستییە کە پاڵەوانی تراژیدی رزگاربوونی مەحاڵە بەڵام شەکسپیر لە نزیك کۆتایی شانۆنامەکانیدا تروسکاییەکی چۆنیەتی رزگاربوونیان پیشان دەدات، ئەمەش بەلای کەم وا دەکات پاڵەوانی تراژیدی بە ئاسوودەی سەربنێتەوە، ئەوەتا دوایین وشەکانی ئۆتێللۆ گەواهی بۆ داوێن پاکی دیسدەمۆنا دەدەن کە بەدەستی خۆی کوشتبووی، ماکبێت زۆر دڵ رەق و دڕەندەبوو، بەڵام بیروبۆچوونی بەرامبەر ژیان باش



بوو، ئەوەشی زانی کە ئەو خواوەندانەی ئەو دەیپەرستن بێ ئومێدیان کردو یارمەتییان نەدا، بۆیە لە شوینێکی شانۆنامەکەدا ماکبێت دەڵێت:

**هەموو ئەو شتانەی لەگەڵ پیردا پێویستە هەبن.**
**وەك شەرەف، خۆشەویستی، هاوڕێی باش.**
**پێویستە ئێستا من چاوەروانیان نەکەم.**

لە شانۆنامەی (شالیر)دا دوای کارەساتە سەرەکییەکە کەللەڕەقی لیر نامێنێت و دیدو بۆچوونی تەواو دەگۆڕێت، هەرچەندە (لیر) رزگاربوونی مەحاڵە، بەڵام رێگەی پەشیمانی لەمەر بڕیارە چەوتەکانی پێدراوە، زیاتریش رێگەی دراوەتێ پەشمانی خۆی بۆ کۆردیلای دوورخراوە دەرببرێت، دوای ئەم دەربڕینی پەشیمانییە (لیر) بە ئاسودەی پشت لە ژیان دەکات و بۆ هەتا هەتایە بەجێی دێلێت.

بەم شێوەیە هەر تراژیدیایەك لە خاڵێك کۆتایی دێت و ژیانی مرۆڤایەتی پێ بەهادارتر دەکرێت و پاڵەوانی دابڕاو لە ژیان پایەیەك بەرزدەکاتەوە، هەست و هەڵەکانی مرۆڤ بەرەو نەمان دەچێت و کاتێك رەشەباو گەردەلوولێکی توند بەلەمە چارۆکەدارەکەی لە قەفەزی زیندان- ژیان- دەرباز دەکات و بەرەو مەئوایەکی هێمن و ئارام هەنگاو دەنێت، نموونەی ئەم راستییەش لە شانۆنامەی ( ئەنتۆنی و کیلۆپاترا) بەرچاو دەکەوێت، لە کاتێکدا ئەنتۆنی (Antony) بە هۆی توڕەیی و رق و کینەی زۆر نەفرەت لە کیلۆپاترا (Cleopatra) دەکات و دەیەوێ بە خەنجەرەکەی خۆی بکوژێت، بەڵام ئەنتۆنی رێگەی پێ نەدراوە بەم شێوەیە و لەو کاتەدا کۆتایی بە ژیانی بهێنێت چونکە ئەمە نابێتە هۆی گەیشتن بە پایەی نەمریی، بۆیە لە ژیان بەردەوام دەبــێ تا ئەو کاتەی لە باوەشــی (کیلۆپاترا) و بە دیدو بۆچوونێکی تەواو جیاواز سەر دەنێتەوە.بەم شێوە دەتوانین بڵێین پاڵەوانی هەموو تراژیدیاکان تاکە کاتی بەهادار لە ژیانیان کاتی کۆتایی پێ هاتنیەتی—مردن- ی.

تایبەتمەندییەکی دی شانۆنامە تراژیدییەکان شمولیەتە(Universality) ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئێمەی خوێنەر تەنها بە دوای بەخت و چارەنووسی پاڵەوان ناگەڕێین، بەڵکو

ئاگاداری ئەوەین کە لە هەمان کاتدا چەندین هێزی دی لە ئارادان کار لە ژیانی مرۆڤ دەکەن، ئەمە زۆر زیاترە لە تەنها دەربڕینێکی بەهرەمەندانەی چارەنووس، هەروەها ئەوەش دەگەیەنێت کە مرۆڤ وەك بووکە شووشەیەکە لە دەستی چەند هێزێکی مەزن، لە شانۆنامەی (ماکبێت) دا ئەو بیروبۆچوونانە بە هۆی بەکارهێنانی ژیرانەی سەرووسروشت (Supernatural) ئاماژەی بۆ کراوە، زیاتریش ئەمە وامان لێدەکات کە باوەڕ نەکەین کە ماکبێت توانای زاڵ بوونی بەسەر هێزەکانی دژی خۆی هەبێت. لە شانۆنامەی (ئەنتۆنی و کلیۆپاترا) دا فالگرەوەکە (Soothsayer) ئەنتۆنی ئاگادار دەکاتەوە لە چوونە پێش، چونکە چارەنووس دژی ئەو وەستاوەو داوای لێدەکات بگەڕێتەوە بۆ میسر، ئێمەی خوێنەر بەزەییمان بە (ئەنتۆنی) دێتەوە، چونکە هێزە مەزنەکان دژی وەستاون و ئەو هێزانەش بڕیارەکانیان حەتمییە. لە شانۆنامەی (شالیر)دا هیچ تەکنیکێکی وەك سێ جادوگەرەکەی (The Three Witches) شانۆنامەی (ماکبێت) و فالگرەوەکەی شانۆنامەی (ئەنتۆنی و کلیوپاترا) نییە کە پێمان رابگەیەنێت کە کۆتایی (لیر) حەتمییە، بەڵام لەم شانۆنامەیەدا، واتە (شالیر) شەکسپیر بەراشکاوی ئەوە پیشان دەدات کە (لیر) و گلۆستەر (Gloucester) بە تەنها نەبوونەتە قوربانی ناسوپاسگوزاری رۆڵەکانیان، بەڵکو بوونەتە قوربانی شۆڕشێکی سەرتاسەری لە سروشت، ئەو سروشتەی کە زڕ دایکێکی دڵ رەقی هەموو مرۆڤێکەو ئەمەش بەرفراوانی بە شانۆنامەکە دەبەخشێت و خوێنەر وا هەست دەکات کە لەو کاتەدا سەیری چەند بابەتێکی نوێی ژیان دەکات. مرۆڤ بووکەشوشەی دەستی خواوەندە دڵ ڕەقەکانە، گەردوون تەنها شانۆیەکە مرۆڤ لەسەریدا دەسورێتەوەو نارەحەتی دەچێژێت بێ ئەوەی بتوانێ یارمەتی خۆی بدات. ئەو شتەی کە زۆربەی خەڵکی لە ژیانی گەوهەریدا بیری لێدەکەنەوە تەنها وەهمێکە و هیچی دی. لە شانۆنامەی (شالیر)دا گلۆستەر دەڵێت:

**ئێمە لە ژێر دەستی خواوەندەکان،**
**وەك باڵندەی دەستی مندالآنین،**
**کە بە مەبەستی یاری کردن دەمانکوژن.**



ئایا دەتوانین بگەینە ئەو ئامانجەی کە شەکسپیر لە تراژیدیەکانیدا ویستویەتی مەزهەبی قەزاو قەدەر (fatalism)ی و دلڕەقی سروشت و دژ وەستانی هێزە گەردوونیەکان بەرامبەر مرۆڤ پێشان بدات؟ بە بۆچونی من نەخێر، چونکە ژمارەیەکی زۆر قسەی کارەکتەری شانۆنامەکانی شەکسپیر بەدەستەوەن کە پێچەوانەی ئەوە دەسەلمێنن. ئەوەتا لە شانۆنامەی ( یۆلیۆس قەیسەر)دا کاسیۆس (Cassius) بە بروتەس (Brutus) دەڵێت:

**بروستەی ئازیز، بڕوا بکە،**
**هەڵە لە ئەستێرەکانمان دا نییە،**
**بەڵکو لە خۆمان دایە.**
**زیاتر دەڵێت:**
**لە هەندێ کات دا بڕیاردانی چارەنوس**
**لە دەست مرۆڤ خۆی دایە.**

پێش ئەوەی هەوڵی خستنە ڕووی بیروبۆچونەکانی شەکسپیر بەرامبەر بە ژیان بدەین، پێویستە ئەوە لە یاد نەکەین کە هەموو ئەو کارەکتەرانەی شەکسپیر کە بڕوایان بە مەزهەبی قەزاو قەدەر هەیە هیچیان سەرکەوتوو نەبوون، بەڵام ئەو کارەکتەرانە نزیکن لە کەسانی ژیانی راستەقینە کە تێیدا بەدبەختی هەموو کات پاساوی سەرنەکەوتنە. ئایا کارەکتەرێکی وەك (لیر) تا چ رادەیەك سەرنەکەوتنی دەگەرێتەوە بۆ بوونی خالی لاواز لە کەسایەتیدا و تا چ رادەکیش بۆ چارەنووس؟

ئەو دوو تایبەتمەندییە واتە کارەکتەری خاوەن خالی لاواز و چارەنووس لە هەموو تراژیدیەکانی شەکسپیر بەدی دەکرێن و تێیاندا نووسەر زۆر ژیرانە کارەکتەر و چارەنووسی لە هونەرەکەیدا چنیوە.

شەکسپیر زۆر هونەریانە سوودی لە هەموو ئینتباعێك وەرگرتووە. گەر شانۆنامەی (ماکبێت) وەربگرین دەبینین هەڵەی بنەڕەتی لە کارەکتەری ماکبێت

چاوچنۆكی و خوێنرێژییه له ژیاندا. كهواته شانۆنامهكه درامایهكه بهنده لهسهر چاوچنۆكی ناشایسته، بهڵام یهكهم كهس كه دهبینرێت، جادوگهرهكانن كه ههموو بهیهكهوه لهسهر خاڵه لاوازهكهی كهسایهتی (ماكبێت) كاردهكهن. به هۆی هاندان و ئهو پێشبینییهی كه دهڵێت (ماكبێت دهبێته پاشا) جادوگهرهكان هیواو ئاواتهكانی ماكبێت دهورووژێنن و كاریان لهسهر دهكهن. ئێستا پرسیارێك دێته بوون، ئایا ماكبێت به هۆی چاوچنۆكی یان به هۆی ململانێ لهگهڵ چارهنووس سهر نهكهوت؟ شهكسپیر وهڵامی ئهو پرسیاره به كراوهیی بهجێ دههێڵێت و سوود له ههردووكیان وهردهگرێت، راسته شانۆنامهكه درامای كارهكتهره، بهڵام هێزی سهرووسروشت ههردهم ئامادهیه.به ههمان شێوه له شانۆنامه (شالیر) دا كارهكتهرو چارهنووس زۆر توند بهیهكهوه لكێنراون.

ههرچهنده لهم شانۆنامهیهدا هێزێكی دیار وهك جادوگهركانی (ماكبێت) بهرچاو ناكهوێت، بهڵام وا ههست دهكهین كه هێزێكی بهتوانا ههیه ( لیر)ی گهمارۆداوه و دهربازبوونی مهحاڵه. وتهیهكی رۆمانییه كۆنهكان ههیه دهڵێت:

((كاتی خوا دهیهوێ یهكێك لهناو ببات، له سهرهتادا شێتی دهكات)).

بهم شێوهیه ئێمهی خوێنهر بهزهییمان بهو كهسه بهدبهختە دێتهوه كه رووهو ههڵدێری نهمان ههنگاو دهنێت. بهمهش كاریگهری تراژیدی پتهوتر دهكرێت و ئازار و ناخۆشی نزیك دهبێتهوه له تراژیدیای گریكی.

شایانی ئاماژه بۆ كردنه شهكسپیر لهو ململانێیهی نێوان مرۆڤ و خواوهندهكان كه له شانۆنامهكانی دا پیشانیان دهدات لایهنی هیچیان ناگرێت. شهكسپیر له شانۆنامهكاندا ئهوهش پیشان نادات كه هێزێكی به بهزهیی ههیهو له كۆتاییدا پاداشتی چاكه و سزای خراپه بدات. له راستیدا خواوهندهكانی شهكسپر زۆر نایهكسانن.

ههندێك كهس پێی وایه شهكسپیر زۆر گرنگی به بونیادی نهخشهی شانۆنامهكانی نهداوه، بهڵام ئهمه راست نییه، چونكه شهكسپیر زۆر ئهزمونی نهخشهدانانی سهركهوتوی ئهنجام داوه. له شانۆنامهی (شالیر) و زۆربهی ئهوانی دیكهش شهكسپیر



دوو چیرۆكی داناوهو ههریهكهیان كۆمهڵێك كارهكتهر رۆڵهكان دهگێرن، یهكێكیان چیرۆكی سهرهكی ئهوی دیكهیان لاوهكی.

ههردوو چیرۆكهكه بهیهكهوه گرێدراون به مهبهستی پتهوكردنی كاریگهری یهكتری و تهواوكردنی یهكتر. ههردوو چیرۆكهكه پێكهوه دهبنه هۆی پێكهێنانی نهخشهیهكی درامی تهواو.

چیرۆكی كچه بێ بهزهیی و ناسوپاسگوزارهكانی (لیر) چیرۆكی سهرهكییهو دهبێته هۆی لهناوچون و كهساس بوونی (لیر). لهههمان شانۆنامهدا چیرۆكی گلۆستهر و ئیدمۆند (Edmund) ی كوڕه ناپاكهكهی چیرۆكی لاوهكییه و لهگهڵ چیرۆكه سهرهكییهكه یهك دهگرن و بهرهو كۆتایی هاوبهش ههنگاودهنێن. لهوانهیه شانۆنامهی (ئوتێللۆ) نمونهیهكی چاكی نهخشهی نموونهیی (ideal) بێت، چونكه لهم شانۆنامهیهدا پێشهكی ههیه، ئینجا تهشویق (Suspense) تا دهگاته بهرزترین خاڵی رووداوهكان (Climax)، دواتر تهشویقی زیاتر له نزیك كۆتایی، چونكه كهس نازانێت ئاخۆ خراپ یان باش لهو ململانێیه سهردهكهوێت. له راستیدا كۆتایی شانۆنامهكان نادیاره، چونكه زۆر جار له نزیك كۆتایی گۆڕان و ههڵگهڕانهوهی كتوپڕی به ئهنقهست و چاوهڕوان نهكراو بهرچاو دهكهوێت ئهمهش به مهبهستی پتهوتركردنی كاریگهری تراژیدییه.

**سهرچاوه: پهرتووك** Lear King

# بەهلول لە شانۆنامەکانی شەکسپیردا(*)



**سەرەتا:**

لەم لێکۆلینەوەیەدا هەولّم داوە بەپێی توانا کارەکتەرێك لەو کارەکتەرانەی کە لە زیاتر لە نیوەی شانۆنامەکانی شەکسپیردا بەرچاو دەکەوێ شی بکەمەوە لە ڕووی شێوەو زمان و تایبەتمەندێتی و ئەرکەکانی لە شانۆنامەکاندا ئەویش کارەکتەری (بەهلول)ە. بەهلول لە نۆزدە شانۆنامەی شەکسپیردا هەیە لە هەریەکەیان چەندین ئەرك و تایبەتمەندێتی پێ بەخشراوە. ڕاستە نووسەرانی تریش (بەهلول)یان لە شانۆنامەدا بەکارهێناوە بەلاّم هیچ یەکێکیان بەشێوەی شەکسپیری بلیمەت سودیان لێ وەرنەگرتووەو بەشێوەی ئەو، ژیرانە مامەڵەیان لەگەڵ نەکردووە. زیاتریش نووسەران بەشێوەیەکی گشتی کارەکتەری (بەهلول) یان لە کۆمیدیا بەکارهێناوە، هەرچی شەکسپیرە لە کۆمیدیا و تراژیدیا بەکاری هێناوە بۆ مەبەستی جیاجیا.

دەمەوێ لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوەش بکەم کە لەم لێکۆڵینەوەیەدا من دوو شانۆنامەم هەلبژاردووە وەك نموونە شانۆنامەکانی شەکسپیر ئەوانیش شانۆنامەی (چۆن حەز دەکەی)" As you like It" کە کۆمیدیایەو شانۆنامەی (شالیر) "king Lear" کە تراژیدیایە.



## بەهلول: پێناسەو ئەرکەکانی

بەهلول وەك زارەوە وا پێناسە کراوەکە ئەکتەرێکی کۆمیدییە و گێلێتی یاخود شێتی، چ راست چ ساختە، دەبنە هۆی پێکەنین. " بەهلول مۆڵەتی رەخنەگرتن و ئامۆژگاری کردن و تاڕادەیەکی سنورداریش گاڵتە پێکردنی گەورەکانیان پێ بەخشراوە. بەهلول بەهۆی جل و بەرگە رەنگاو رەنگ و کڵاوە باریك و لارەکە و پێڵاوە تا ڕادەیەك گەورەکەیەوە دەناسرێتەوە.

بە شێوەیەکی گشتی بەهلول کەم ئەندام، گۆجە یان شەمولەیە. هەندێك کەس لە چاخەکانی ناوەراستدا لەو باوەرەدا بوون پاراستنی بەهلول لە کۆشکی میرەکان و ماڵە



دەوڵەمەندەکان دەبێتە هۆی پاراستنی کۆشك و تەلارەکانیان لە چاو پیسی. دەبێ ئەوەش لە یاد نەکەین کە بەهلول هەر لەسەردەمی میسیریەکانەوە تاوەکو سەدەی هەژدەهەم لەلایەن میروماڵە دەوڵەمەندەکان پارێزراون.

سەبارەت بە ئەرکەکانی بەهلول لە شانۆدا، وەك لە پێناسەی سەرەوە ئاماژەی بۆ کرا، کارەکتەرێکە سەرچاوەی پێکەنینە، ئەرکێکی قورسی لەسەر شانە لە کۆشکی میرەکان ئەویش بە پێکەنین هێنانی گەورەکەیەتی هەر کاتێ داوای لێ بکرێ. لە ناو کۆشکدا بەهلول چەندین تایبەتمەندێتی پێ بەخشراوە وەك رەخنەگرتن و ئامۆژگاری کردنی گەورەکەی بەڵام لە ژێر پەردەی زیرەکی و فەلسەفەدا. لەبەر ئەوەی بەهلول لە هیچ چینێکی کۆمەڵ جێگەی نابێتەوە بۆیە دەتوانێ راستی شتەکان ببینێ، ئەرکی سەرەکی بەهلول، جگە لە پێکەنین، خستنە ڕووی کەم و کوڕییەکان و گەندەڵییەکانی کۆمەڵە. لە شانۆدا بەهلول توانج لە چالاکی هەموو ئەکتەرەکان دەدات.

دەبێ پەنجە بۆ ئەو حەقیقەتەش رابکێشین کە بەهلول لە شانۆنامەکانی شەکسپیردا بەهێزترین بوونی هەیە و تیایاندا مۆڵەتی رەخنەگرتنی تەواوی پێ بەخشراوەو تاڕادەیەکیش رۆڵێکی سەرەکی دەبینێ. بەهلولە لە شانۆنامەکانی شەکسپیردا هەموو تایبەتمەندێتییەکانی تێدا بەدی دەکرێت و توانجیش لە هەموو رووداوە تراژیدی و کۆمیدییەکان دەدات.

## بەهلول لە کۆمیدیا:



لەسەرەتادا پێوستە ئاگاداری ئەو راستیەیە بین کە جەماوەری شانۆیی سەردەمی شەکسپیر واتە سەردەمی ئەلیزابێتی، زۆر حەزیان لە کۆمیدیا بووە زۆربەی ئەکتەرە بەناوبانگەکانی ئەو سەردەمە ئەو ئەکتەرانە بوون کە رۆڵی کۆمیدییان لە شانۆنامەکاندا دەگێرا وەك (بوربەیگ) و (کێمپل) ئەوانەش وەك ئەستێرەکانی سینەما و تەلەفزیۆنی ئێستا رێزیان لێ دەگیراو خەڵکی خۆشیان دەویستن.

ئەگەر بمانەوێ ئەو هۆیانە بخەینە روو کە پاڵیان بە شەکسپیرەوە ناوە بۆ بەکارهێنانی کارەکتەری بەهلول لە کۆمیدیاکانی ئەوا هۆ زۆرە بەلاّم من لێرەدا تەنها دوو هۆی سەرەکی دەخەمە روو، یەکەمیان لەبەر ئەوەی شەکسپیر خۆی لەلایەك نووسەرو لەلایەکی تریش خاوەنی بەشێکی ( هۆڵی شانۆی جیهان) بوو، ئەو شانۆیەی کە شانۆنامەکانی شەکسپیری لەسەر نمایش دەکرا، بۆیە شەکسپیر هەوڵێکی زۆری دەدا بۆ رازی کردنی جەماوەرو نوسین بەپێی چێژی ئەوان. ئەو هۆیەش لەوانەیە رۆڵی سەرەکی بەهلول لە هەندێ لە شانۆنامەکانی شەکسپیر روون بکاتەوە، هۆی دووەمیش ئەوەیە کە بەهلول لە کۆمیدیا وەك تەکنیکێك بەکارهاتووە بۆ پێکەنیناوی تر کردنی و پاشان سەرکەوتنی



شانۆنامەکە، بەلاّم نابێ ئەوە لە یاد بکەین کە ئەرکی سەرەکی بەکارهێنانی بەهلول لە شانۆدا بۆ رەخنەگرتن بوو.

## بەهلول لە تراژیدیا:

ئەو پرسیارەی کە زۆر جار بەرچاو دەکەوێ ئاخۆ دەبێ شەکسپیر بۆچی کارەکتەرێکی کۆمیدی وەك (بەهلول)ی لە تراژیدیا بەکارهێنابێ. باسی زۆر لێوە کراوە هۆیەکەشی گەرێندراوەتەوە بۆ بلیمەتی شەکسپیری شانۆنامەنووس کە پێی وابوو تراژیدیای گریکی، کە پرییەتی لە مەرگ و کوشتن و خوێن، بەبێ کارەکتەرێکی کۆمیدی سەرکەوتوو نابێ چونکە بە دڵی جەماوەر نابێ، بەلاّم وەك چۆن (والتەر رالی) دەڵێ: (تێکەلاّو کردنی تراژیدیاو کۆمیدیا لە شانۆی ئەلیزابێتی بەگشتی، وەلاّمەکەی زۆر ئاسانە چونکە پێویست بووە، واتە تەنها بەبوونی کارکتەرێکی کۆمیدی جەماوەر چێژی لێ وەردەگرت و بە سەرکەوتوو دەژمێردرا).

هۆیەکی تری ئەو راستییەش ئەوەیە، وەك لەسەرەوە ئاماژەی بۆ کرا، ئەکتەرە بەناوبانگەکانی ئەو سەردەمە ئەکتەری کۆمیدی بوون بۆیە ئەگەر شانۆنامەنووس بیویستایە شانۆنامەکەی سەرکەوتوو بێ، دەبوو شوێنێك بۆ ئەو ئەکتەرانە لە شانۆنامە تراژیدییەکانی بکاتەوە. بەم جۆرەش بەدڵی جەماوەر دەبوو.

من لەو باوەڕەدام شەکسپیر سوودێکی زۆری لەم پێویستیەیە وەرگرتبێ چونکە لە زۆر لە شانۆنامە تراژیدییەکانی، کە (شالیر) یەکێکە لەوان، بەهلولی بەکارهێناوەو رۆڵێکی سەرەکیشی پێ بەخشیوە. دەبێ ئەوەش لەیاد نەکەین کە وەلاّمی پرسیارێکی وەك بۆچ بەهلول لە تراژیدیا دەردەکەوێ؟ بدەینەوە. بەڕای من لە تراژیدیادا، جیا لە کۆمیدیا، مەبەستی سەرەکی دانانی بەهلول، بۆ بەراوردکاری و بەهێزتر کردنی تەنگژە تراژیدییەکان و دڵ خۆش کردنی جەماوەرە. دانانی بەهلول لە تراژیدیا پێویستییەکی حەتمی بوو وەك لە پێشەوە باسی لێوە کرا. لە کۆتاییشدا پێم وایە شەکسپیر لەوباوەڕەدا بوو کە بوونی کارەکتەرێکی کۆمیدی لە تراژیدیاکانی دەتوانێ کاریگەری تراژیدی پتەوتر بکات.

## بەهلول لە شانۆنامەی (چۆن حەز دەکەی) (As You Like It):

لە سەرەتادا پێویستە ئەوە بزانین کە کارەکتەرێك بەناوی تەچستۆن Touchstone رۆڵی بەهلول لەم شانۆنامەیەدا دەگێڕێت. (تەچسۆن) یەکێکە لە نایابترین ئەو کارەکتەرانەی شەکسپیر دای هێناون. هەوڵ دان بۆ شیکردنەوەی کارەکتەری تەچستۆن کارێکی ئاستەنگە چونکە وەك (مانهیم) نووسیویەتی (تەچسۆن زیرەکترین و ئالۆزترین کارەکتەرە لە شانۆنامەکەدا). هەروەها (مانهیم) لە شوێنێکی تر نووسیویەتی (تەچستۆن نەهلیستێکی رەوانبێژەو پێی وایە ژیان دەبێ بە پێکەنین هێنانی خەڵی تێدا بێ بەهۆی دەست نیشانکردنی گەندەڵی و کەم و کوڕی یەکانی کۆمەڵ، بە تایبەتی چینی دەوڵەمەند).

تایبەتمەندییەکی تری بەهلولی شانۆنامەکانی شەکسپیر ئەوەیە کەدڵسۆزن بۆ گەورەکانیان، ئەوەتا تەچستۆن زۆر دڵسۆزە بۆ (سیلیا)ی کچی گەورەکەی و کچەش ئەو ڕاستییەی دەزانی بۆیە لە شوێنێکی شانۆنامەکە دەڵێ:

**(تەچستۆن زۆر دڵسۆزەو بۆ هەموو**
**شوێنێکی سەر ئەو زەمینە لەگەڵم دێت).**

لەسەرەتای شانۆنامەکە یەکێك لە ئەرکە سەرەکیەکانی تەچستۆن گاڵتەکردن بوو، بەڵام دوای کۆچ کردنی بۆ دارستانی ئاردەن لەگەڵ (سیلیا)و (رۆزالایند)ی ئامۆزای، وەك پێوەرێك بەکارهاتووە بۆ بڕیاردانی چاکێتی و زیرەکی و گەمژەیی و نەزانی کارەکتەرەکانی تر. زیاتریش گاڵتە و رەخنەکانی تەچستۆن هەموویان پەیوەندییان بە بیرۆکە سەرەکییەکانی شانۆنامەکە هەیە جۆرە تێروانینێکی تری جیا سەبارەت بە بیرۆکە سەرەکیەکان دەخەتە بەرچاو.

تەچستۆن لە سەرەتای شانۆنامەکە رۆڵێکی لاوەکی هەیە و تەنها یەك جار دەردەکەوێ، بەڵام دوای کۆچ کردنەکەی بۆ دراستانی ئاردەن دەبێتە کارەکتەرێکی سەرەکی شانۆنامەکە و چیتر بە بەهلول ناژمێردرێت بەڵکو رەخنەگر بوو پڕ بەمانای



ووشە. سەبارەت بە زمانی تەچستۆن، زمانێکی پاراوو درکە و خوازە ئامێز بەکاردەهێنێ و بەدەوام یاری بە ووشە دەکات. زیاتریش تەچستۆن چەند شێوازێکی قسەکردن بەکاردەهێنێ بە گوێرەی چینی ئەو کەسەی کە قسەی ئاراستە دەکات، بۆ نموونە کاتی لەگەڵ میردا دەدوێ، بەلایەنی کەم دەبێ بەڕێزەوە قسە بکات و لە سنووری مۆڵەتەکەی دەرنەچێت، بەڵام کاتێ لەگەڵ شوانەکەی دراستانی ئاردەن قسە دەکات خۆی بە زاناترو ژیرتر دەزانێ بۆیە بە شێوەیەکی تر قسەیان لەگەڵدا دەکات.

شایەنی ئاماژە بۆ کردنە زیرەکی ژمارەی زۆری بەهلول لە شانۆنامەکانی شەکسپیردا بنچینەیەکی رەخنەییان هەیە. هەروەها بەهلول لەوەش ئاگادارە کە ئەو مۆڵەتێکی سنووورداری پێ بەخشراوەو ئەگەر بێتو لەو سنورە لابدات ئەوا سزا دەدرێت، بۆیە کاتێ تەچستۆن هەڵەیەك بەرامبەر بەمیر دەکات،( سیلیا) دەڵێ:

**(تەچستۆن دەبێ سزا بدرێت و**
**بە قامچی لێی بدرێت).**

ئەگەور بێینە سەر ئەرکەکانی تەچستۆن لەم شانۆنامەیەدا دەبینین سەرباری دابین کردنی پێکەنین و خۆشی دروست کردن، ئەرکی سەرەکی رەخنەگرتنە لە هەڵس و کەوت و ئاکارو داب و نەریتی گەورەکان و خەڵکی بەگشتی. ئەو کارەکتەرانەی کە لەم شانۆنامەیەدا کەوتونەتە بەر شاڵاوی رەخنە گاڵتەئامێزەکانی تەچستۆن خزمەتکارەکانی کۆشکی میرن. تەچستۆن زۆر رەخنە لەو کارەکتەرانە دەگرێت، تا هەندێ جار دەگاتە رادەی رەخنەگرتنی سادەو ساکار بۆنموونە کاتێ تەچستۆن لەگەڵ (لوبۆ)دا دەدوێ کە خزمەتکارێکی کۆشکە، پێی دەڵێ:

**(من شێوازی ریش تاشینی تۆم بەدڵ نیە).**

دەبێ ئەوە لەیاد نەکەین کە بەهلول لە شانۆنامەکانی شەکسپیردا فلسەفەیەکی شاراوەی هەیە بەڵام لەهەر شانۆنامەیەك کەسایەتی خۆی هەیە. ئەوەتا تەچستۆن دەبێتە هۆی دابین کردنی پێکەنین بە هۆی لاسایی کردنەوەو توانج لێدان لە کارەکتەرەکانی تری شانۆنامەکە.

له كۆتاییدا ئەوە ماوە بیلێم هەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی شانۆنامەکە تەچستۆن بەردەوام رەخنەو تێبینییەکانی خۆی سەبارەت بەهەڵەو کەموکورتییەکانی کۆمەڵ خستۆتە ڕوو بەڵام بەشێوەیەکی وا ناڕاستەوخۆ کە هیچ لە قوربانیەکان هەستیان پێ نەکردووە چونکە هەردەم وایان بەبیردا دەهات کە ئەو تەنها بەهلولە قسە دەکات بۆیە نابێ قسەکانی بە گرنگ وەربگیرێت و بەم جۆرەش تەنها پێکەنینیان بۆ دەمایەوە بەهلول لە شانۆنامەی (شالیر)دا (King Lear) راستە بوونی کارەکتەری بەهلول لە تراژیدیا شتێکی نامۆو سەیرە، بەڵام لەوەش سەیرتر ئەوەی کە بەهلول ڕۆڵێکی سەرەکی هەبێ لە تراژیدیترین بەشی شانۆنامەکە. من پێم وایە شەکسپیر لەو باوەڕەدا بوو کە تراژیدیا دەکرێ کاریگەرتر و بەهێزتر بکرێ بە هۆی تێ کردنی فاکتەرێکی کۆمیدی بەمەبەستی بەراورد کردن و خۆشی بەخشین. بەهلول، وەك چۆن (برادلی) نووسیویەتی: (یەکێکە لە سەرکەوتنەکانی شەکسپیر لە شانۆنامەی "شالیر" دا) و بیر لە تراژیدیای (شالیر) بکەوە بەبێ بەهلول ئاخۆ دەیناسیتەوە؟! بێ گومان نەخێر، هەرکە بەهلول لە شانۆنامەکە دەرهێنرا ئەوا هاوسەنگی و حەبکەی شانۆنامەکە تێك دەچێ.

بەهلولەکەی شالیر زۆر لەوە گرنگترە کە ناوەکەی دەیگەیەنێ. بەهلول لەو کاتەدا دێتە سەر تەختەی شانۆ کە داڕووخانی سایکۆلۆژی شالیر لە سەرەتادایە و لە کۆتایی بەشی دووەمی شانۆنامەکە بەتەواوی وون دەبێ، چیتر نابینرێت و نابیسترێت چونکە شانۆنامەکە چیتر پێویستی بەبەهلول نەماوەو بەهلول ئەرکە سەرەکیەکانی خۆی ئەنجام داوە. زیاتریش کارەکتەرێکی تر دەست دەکات بەگێڕانی ڕۆڵی بەهلول، ئەویش (ئێدگار) بەساختە شێتە لەبەر جەلادەکانی کچی شالیر. شایانی ئاماژە بۆ کردنە بەهلول پاشا شێتەکەی خۆی بەجێ ناهێڵێ بەڵکو لەگەڵی دەمێنێتەوە ئەمەش دڵسۆزی بەهلول بۆ پاشا دووپات دەکاتەوە، کە یەکێکە لە تایبەتمەندێتییەکانی بەهلولی شانۆنامەکانی شەکسپیر.

سەبارەت بە زمانی بەهلول لەم شانۆنامەیەدا زمانێکی پاراوو درکەوخوازە ئامێزی هەیە هەموو کارەکتەرەکانی تری شانۆنامەکە خۆزگەی ئەوە دەخوازن بتوانن بە زمانی بەهلول قسە بکەن، بۆ نموونە کاتی شالیر بۆ دواجار چاوی بە (گلۆستسەر) دەکەوێ بە زمانی بەهلول قسە دەکات دەڵێ:





**(کاتی لە دایك دەبین دەگرین چونکە هاتوینەتە دونیایەك کەوەك تەختەی شانۆیەبۆ گەممژەکان).**

لەم شانۆنامەیەدا بەهلول لە تراژیدیای (لیر) دەگات، بۆیە بەردەوام بەقسە پێکەنیناوییەکانی و بەبەزەییەوە هەوڵ دەدات ناخۆشییەکانی کەمتر بکاتەوەو دڵی بداتەوە. یەکسەر دوای شێت بوونی شالیر سروشتی ژیرێتی بەهلول دەگۆڕێت چونکە بەهلول پێی وایە ئامۆژگاری کردن درەنگە بۆیە تەنیا هەوڵ دەدا دڵی شالیر خۆش بکات وکارەساتە سایکۆلۆژییەکەی لەبیر بباتەوە، بەڵام وەك چۆن پرۆڤیسۆر (تێرنەر) نووسیویەتی (هەوڵەکانی بەهلول بێ هودە بوون چونکە درەنگ بوو).

تایبەتمەندێتییەکی تری بەهلول لەم شانۆنامەیەدا هەبوونی توانای وەڵام دانەوەی خێرا و پڕبەپێست و زیرەکانەی هەموو ئەو پرسیارانەی بوو کە ئاراستەی دەکرا. لە شانۆنامەکە زۆر نموونە هەن بۆ سەلماندنی ئەو راستییە بەڵام من لێرەدا تەنها پەنجە بۆ دوو نموونەی بەرچاو رادەکێشم. یەکەمیان بەهلول شالیر بەگەمژە ناودەبات بزانین پاساوی بەهلول بۆ ئەمە چییە:

**شالیر: ئایا تۆ بەگەمژ ناوم دەبەیت؟**

**بەهلول: بەڵێ چونکە هەموو ناو و**

**نازناوەکانی ترت بوونە هەڵم!!**

نموونەی دووەمیش وەڵامدانەوەی بەهلولە بۆ پرسیارەکەی شالیر پاش ئەوەی ببــووە قەشمەرجاڕی کچ زاواکانی.

**شالیر: کێ دەتوانێ پێم بڵێ من کێم؟**

**بەهلول: من، تۆ تارمایی لیریت!!**

بەهلول لەم شانۆنامەیەدا رۆڵێکی سەرەکی دەبینێ رۆڵەکەشی جیا لە تەچستۆن، خۆشی بەخشین و بەراودکاری وبەهێزترکردنی تراژیدییێتی رووداوەکانە. لەم شانۆنامەیەدا بەهلول دەنگی ویژدانی شالیرە و بەردەوام لە مەترسییەکانی ئاگاداری دەکاتەوە و ئامۆژگاری دەکات، بەم شێوەش بە تەواوی ئەو مەبەستانە دەپێکێت کە بۆی دەست نیشان کراون. دەبێ ئەوەش لەیاد نەکەین ئەرکی بەهلول تەنها بە پێکەنین هێنانی جەماوەر نییە بەڵکو وە بیرهێنانەوەی لیرو جەماوەرە بەهەڵەکانی شالیرو بڕیارە چەوتەکانی.

لە کۆتاییدا بەهلول وەك پاساوێك بەکارهاتووە بۆ دەرکردن و نەحەواندنەوەی شالیر لەلایەن کچە گەورەکەی (گۆنریل)، چونکە بەهلول لە خزمەتکارێکی کچەکەی دابوو، ئەمەش هەنگاوێکی سەرەتایی بوو بۆ ناکۆکی شالیر و کچەکانی. ئەوە ماوە بیڵێم کە بەهلول لەم شانۆنامەیەدا وەك ئاوێنەیەکە بۆ شالیر بۆ ئەوەی هەڵەکانی خۆی تێدا بەدی بکات و هەوڵ بدات راستیان بکاتەوە.

## ئەنجام:

شەکسپیر زۆر زیرەکانە سوودی لە پێویستی تێکردنی فاکتەرێکی کۆمیدی لە تراژیدیا وەرگرتووە زۆر هۆشیارانە مامەڵەی لەگەڵ کارەکتەری بەهلول لە کۆمیدیاو تراژیدیاکانی کردووە، بۆ مەبەستی جیاجیا. بەهلول لە کومیدیا ئەرکی سەرەکی دابین کردنی پێکەنین و خۆشییە بۆ جەماوەرو رەخنەی گاڵتە ئامێزە لە کۆمەڵدا. هەرچی ئەرکی بەهلولە لە تراژیدیا، سەرباری دابین پێکەنین و خۆشی بەمەبەستی بەراوردکاریو کاریگەرتر کردنی رووداوە تراژیدییەکانیش بەکارهێنراوە.



لەهەردوو شانۆنامەکە چەندین تایبەتمەندێتی هاوبەش هەیە لە نێوان تەچستۆنی (چۆن حەز دەکەی)و بەهلولی (شالیر) وەك بەکارهێنانی زمانێکی پاراوو درکەوخوازە ئامێزەکەیان و دڵسۆزییان بۆ گەورەکانیان و شێوەی جل و بەرگە رەنگاو رەنگەکەیان و بوونی فەلسەفەیەکی شاراوەو هەبوونی توانای وەڵام دانەوەی خێراو ژیرانەی ئەو پرسیارانەی کە ئاراستەیان دەکرێت. لە کۆتاییدا هەردووکیان ژیرن ژیرێتیان بنچینەیەکی فەلسەفی هەیە و ئامۆژگاری گەورەکانیان دەکەن لە ژێر پەردەی ژیری و فەلسەفەدا و رەخنەی توندیش لە گەورەکانیان دەگرن تا ئەو سنوورەی کە بۆیان دیاریکراوە.

من گەیشتمە ئەو باوەڕەی کە شەکسپیری بلیمەت تەنها نووسەرە کە بەهلولی لە کۆمیدیا و تراژیدیا بەکارهێنابێ و سەرکەوتوانە مامەڵەی لەگەڵدا کرد بێت و سوودی لە تایبەتمەندێتییە مۆڵەت پێ دراوەکانی وەرگرتبێت.

❋ ❋ ❋

## پەراوێز و سەرچاوەکان

* ئەمە کورتەی ئەو باسەیە کەساڵی خوێندنی **١٩٩٦-١٩٩٧** وەك راپۆرتی دەرچوونم پێشکەش بەبەشی ئینگلیزی کۆلێژی ئەدەبیات کراوە بە زمانی ئینگلیزی و لەسەری پلەی زۆر باشم وەرگرتووە.


١- The New encyclopedia Britanice، vol.IV ،P.٢٢.

٢- Academic american encyclopedia، vol.٨، p.١٢٣.

٣- Introduction of King Lear، (ed) Turner، p.XLVI.

٤- Manheim M.، Notes about As You Like It. p.٨٦.

٥- I bid. ، p٩٦.

٦- “ King Lear”، (ed) Turner، w.

٧- I bid.

٨- A.C. Bradley، Shakespearean Tragedy،p.٢٥٩.

٩- “ King lear” (ed) Turner، w.

١٠- I bid




# تێڕامانێك لە بەهلوولەکانی شەکسپیر و سەیدەی تەڵعەت سامان

**نووسینی: هیمداد عبدالقهار محمد**

بێگومان تا ئەمرۆش ولیەم شەکسپیر لە ئەدەبی ئینگلیزیدا بە مەزنترین شانۆنووس دادەنرێت. هەر لەسەردەمی خۆیەوە، واتا لە سەدەی شازدەیەمەوە تا ئەمرۆ قسەو باس لەسەر بەرهەمە ئەدەبییەکانی بەردەوامە، هەر نەوەیەك بەپێی تێگەیشتی خۆی لێکیان دەداتەوەو بە بەراورد کردنی لەگەڵ بیرو بۆچوونەکانی سەردەم راڤەیان دەکات. زیاتریش هەرنەوەیەك چەندین لایەنی نوێ لە بەرهەمەکانیدا هەڵدەهێنجێ کە هەموویان لێهاتوویی و بلیمەتیی ئەو شانۆنووسە دووپات دەکەنەوە.

لە ئەدەبی کوردیشدا تەڵعەت سامان لە بواری شانۆو دەرهێناندا شوێنی پەنچەی دیارە. ئەوەتا چەندین شانۆی نووسیوە و ژمارەیەکی زۆریشی دەرهێناوە. یەکێك لە دوایین بەرهەمەکانی تەڵعەت سامان زنجیرەی تەلەفزیۆنی (کەوەکانی قەرچووغ))بوو، کە تێیدا نووسەر و دەرهێنەر بوو. پێش چوونە ناو باسی بابەتەکەش بە پێوستی دەزانم رای خۆم بەرامبەر بەم دوایین بەرهەمە بخەمە روو. (( کەوەکانی قەرەچووغ)) لەروی بابەت و کارەکتەرو دابەشکردنی رۆڵەکان بەسەریاندا بەرهەمێکی سەرکەوتووە و دواتریش لە رووی هەڵبژاردنی شوێن و کاتی وێنەگرتنەوە. ئەم لێکۆلینەوەیە کورتە بەراوردێکە لە نێوان بەهلوول لە شانۆ نامەکانی شەکسپیرداو (سەیدە) لەم زنجیرە تەلەفزیۆنییەدا. بە چاوپۆشین لەو راستییەی کە شەکسپیر لە شانۆنامەکانی تەنیا بۆ نمایش ئامادە کردووە و

(کەوەکانی قەرەچووغ) زنجیرەیەکی تەلەفزیۆنییە. لەم لێکۆڵینەوەیەدا بەپێی توانا هەوڵمداوە تایبەتمەندی و ئەرك و گرنگیی بەهلوولەکان و سەیدە لە بەرهەمەکاندا روون بکەمەوە. شایانی ئاماژە بۆ کردنە بۆ لێکۆڵینەوە لە بەهلوولەکانی شەکسپیردا من دوو شانۆنامەم هەڵبژاردووە، یەکەمیان شانۆنامەی ((چۆن حەز دەکەی)) کە کۆمیدیایەو دووەمیان شانۆنامەی (شالیر)ە کە تراژیدیایە.

## بەهلوول: پێناسە و ئەرکەکانی

بەهلوول وەك زاراوە وا پێناسە کراوە کە ئەکتەرێکی کۆمیدییە و گێلێتی یان شێتیی چ ساختە، دەبنە هۆی پێکەنین. بەهلوول مۆڵەتی رەخنەگرتن و ئامۆژگاری کردن و تارادەیەکی سنورداریش گاڵتە پێکردنی گەورەکانی پێ بەخشراوە بەهۆی جل وبەرگە رەنگاورەنگ و نارێك و کلاوەکەی سەرییەوە بە ئاسانی دەناسرێتەوە.

بە شێوەیەکی گشتی بەهلوول ((کەم ئەندام، گۆجە یان کورتە بالآیە))(١). هەندێ کەس لە چاخەکانی ناوەڕاستدا لەو باوەڕەدابوون پاراستنی بەهلوول لە کۆشك و دیوەخانی ئاغاو دەوڵەمەندەکاندا دەبێتە هۆی پاراستنیان لە چاو پیسی. دەبێ ئەوەش لەیاد نەکەین کە بەهلوول هەر لە سەردەمی میسرییەکاندا تا سەدەی هەژدەیەم لەلایەن میرو ئاغا و ماڵە دەوڵەمەندەکانەوە پارێزراون.

سەبارەت بە ئەرکەکانی بەهلوول لە بەرهەمی ئەدەبیدا، وەك لە پێناسەی سەرەوەدا ئاماژەی بۆ کرا، کارەکتەرێکە لەناو کۆشك و دیوەخاندا سەرچاوەی پێکەنینە. بەهلوول چەندین ئەرکی پێ سپێردراوە وەك رەخنەگرتن و ئامۆژگاری کردن و دڵخۆش کردنی تەماشاکاران. ئەرکی سەرەکی بەهلوول جگە لە دابینکردنی پێکەنین خستە رووی کەموکوڕی و گەندەڵییەکان کۆمەڵە.

دەبێ ئاگاداری ئەو راستییەش بین کە بەهلوول لە شانۆنامەکانی شەکسپیردا بەهێزترین بوونی هەیە و تێیاندا مۆڵەتی تەواوی پێ بەخشراوە کە رۆڵێکی سەرەکی لەبەرهەمەکاندا بگێڕێ.





## بەهلوول لە شانۆنامەکانی شەکسپیردا

لە سەرەتادا پێویستە ئەوە بزانینکە جەماوەری شانۆیی سەردەمی شەکسپیر، واتا سەردەمی ئەلیزابێتی زۆر حەزیان لە کۆمیدیا بووە، بۆیە زۆربەی ئەکتەرە بەناوبانگەکانی ئەو سەردەمە ئەو ئەکترانە بوون کە رۆڵی کۆمیدییان لە شانۆنامەکاندا دەبینێ وەك (بۆربەیگ و کیمپل) ئەوانەش وەك ئەستێرەکانی سینەماو تەلەفزیۆنی ئێستا رێزیان لێدەگیراو خەڵکی خۆشیان دەویستن.

ئەگەر بمانەوێ ئەو هۆیانە بخەینەڕوو کە پاڵیان بەشەکسپیرەوە ناوە بۆ بەکارهێنانی کارەکتەری بەهلوول لە کۆمیدیا و تراژیدیاکانیدا ئەوا هۆ زۆرن. من لێرەدا تەنیا کەمێك لەو هۆیانە دەخەمە بەرچاو پێش هەموو شتێ لەبەر ئەوەی شەکسپیر خۆی لەلایەك نووسەرو لەلایەکی ترەوە خاوەنی بەشێکی (هۆڵی شانۆی جیهانی) بوو کە هەموو شانۆنامەکانی ئەو سەردەمەی لەسەر نمایش دەکرا، بۆیە شەکسپیر هەموو هەوڵ و توانای خۆی خستبووەگەڕ بە مەبەستی رازی کردنی

جەماوەرەکەی و نووسین بەپێی چێژی ئەوان. ئەو راستیەش لەوانەیە رۆڵی سەرەکیی بەهلوول لە هەندێ شانۆنامەکاندا روون بکاتەوە. لە کۆمیدیادا بەهلوول وەك تەکنیك بەکار هاتووە بۆ پێکەنیناویترکردنی شانۆنامە و پاشان سەرکەوتنی، بەڵام نابێ ئەوەش لەیادبکەین کە ئەرکی سەرەکیی بەهلوول لە کۆمیدیادا رەخنەگرتنە.

بەکارهێنانی کارەکتەری بەهلوول لە تراژیدیادا لەلایەن شەکسپیرەوە بەمەبەستەوە ئەنجام دراوە. چونکە شەکسپیر لەو باوەڕەدا بوو کە تراژیدیای گریکی کە پریەتی لەمەرگ و خوێن و کوشتن، بێ فاکتەرێکی کۆمیدی هەرگیز سەرکەوتن وەدەست ناهێنێ و بە دڵی جەماوەر نابێ، بۆیە شەکسپیر ناچار بوو شوێنێك لە تراژیدیاکانی بۆ ئەکتەرە بەناوبانگەکانی ئەو سەردەمە بکاتەوە.

من لەو باوەڕەدام کە شەکسپیر سوودێکی زۆری لەو ناچارییە وەرگرتووە، چونکە لەزۆر لە تراژیدیاکانیدا کارەکتەری بەهلوولی بەکارهێناوەو لە هەندێکیاندا رۆڵی سەرکییان پێ بەخشراوە، بەرای من لە تراژیدیادا مەبەستی سەرەکی دانانی بەهلوول بۆ بەراوردکاری و بەهێزتر کردنی تەنگەژە تراژیدییەکان و دڵخۆش کردنی جەماوەرە. دانانی بەهلوول لە تراژیدیادا پێویستییەکی حەتمی بوو بۆ سەرکەوتنی شانۆنامەکە. پێم وایە شەکسپیر لەو باوەڕە دابووە کە بەبوونی کارکتەرێکی کۆمیدی لە تراژیدیادا دەتوانرێ کاریگەری تراژیدی پتەوتر بکات.

بۆ هێنانەوەی نموونە و سەلماندنی ئەو راستیانەی کە لە سەرەوە ئاماژەی بۆ کرا، دوو شانۆنامەی شەکسپیر وەردەگرین. شانۆنامەی ( چۆن حەز دەکەی) کە کۆمیدیایەو کارەکتەرێك بە ناوی (تەچستۆن) رۆڵی بەهلوول لەم شانۆنامەیەدا دەبینێ، بەپێی بیروڕای رەخنەگران تەچستۆن یەکێکە لە نایابترین ئەو کارەکتەرانەی کە شەکسپیر دایهێناون.

هەوڵدان بۆ شیکردنەوەی کارەکتەری تەچستۆن کارێکی زەحمەتە، چونکە وەك ((مانهیم))ی رەخنەگر نووسیوەیەتی ((تەچستۆن زیرەکترین و ئاڵۆزترین کارەکتەرە لە شانۆنامەکەدا)). هەروەها ((مانهیم)) لە شوێنێکی تردا نووسیویەتی((تەچستۆن نەهیلستێکی رەوانبێژەوپێی وایە ژیان دەبێ بەهۆی دەست نیشانکردنی گەندەڵی و کەم وکوڕیەکانی کۆمەڵ، بەتایبەتی چینی دەوڵەمەند)) بە پێکەنین هێنانی خەڵکی تێدابێ.



تایبەتمەندییەکی تری بەهلوولی شانۆنامەکانی شەکسپیر ئەوەیە کە دڵسۆزن بۆ ئەو کەسانەی بەچاکی مامەڵەیان لەگەڵ دەکەن و دەیانژیێنن. ئەوەتا تەچستۆن بۆ (سلیا)ی کچی میر زۆر دڵسۆزە و ئامادەیە تا ئەو پەڕی دنیا لەگەڵیدا بڕوات.

ڕاستە لە سەرەتای شانۆناەکەدا ئەرکی سەرەکیی تەچستۆن رەخنەگرتنە، بەڵام دوای کۆچکردنەکەی بۆ دراستانی (ئاردەن) بۆ بڕیاردان لەسەر چاکێتی و ژیرێتی و گەمژەیی و نەزانی کارەکتەرەکانی تر وەك پێوەرێك بەکارهاتووە. تەچستۆن لەسەرەتادا رۆڵێکی لاوەکی هەبوو، بەڵام دوای چوونە دراستانی ئاردەن دەبێتە کارەکتەرێکی سەرەکی و چیتر بە بەهلوول ناژمێردرێت بەڵکو بە رەخنەگر پڕ بە مانەی وشە، تەچستۆن زمانێکی پاراو ودرکەو خوازە ئامێز بەکاردێنی و بەردەوام یاری بەوشەکان دەکات.

ئەگەر بێینە سەر ئەرکەکانی تەچستۆن لەم شانۆنامەیەدا دەبینین سەرباری دابینکردنی پێکەنین، ئەرکی سەرەکی رەخنەگرتنە لە هەڵسوکەوت و ئاکار و دابونەریتیماڵە دەوەڵەمەندەکان و خەڵکی بەگشتی. دەبێ ئەوەش لەیادنەکەین کە بەهلوول لە شانۆنامەکانی شەکسپیردا فەلسەفەیەکی شاراوەی هەیە، بەڵام لەهەر شانۆنامەیەك کەسایەتی خۆی هەیە، ئەوەتا تەچستۆن دەبێتە هۆی دابینکردنی پێکەنین بەهۆی لاساییکردنەوەو توانج لێدان لە کارەکتەرکانی تر.

هەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی شانۆنامەکە تەچستۆن بەردەوام رەخنە و تێبینییەکانی خۆی سەبارەت بە هەڵەو کەمووکوڕییەکانی کۆمەڵ خستۆتە ڕوو، بەڵام بە  شێوەیەکی وا ناڕاستەوخۆ کە هیچ لە قوربانییەکان هەستیان پێ نەکردووە، چونکە هەردەم وایان بەبیردا دەهات کە ئەوە تەنیا بەهلوولە قسەدەکات بۆیە نابێ قسەکانی بایەخیان پێ بدرێ و بەم جۆرەش تەنیا پێکەنینیان بۆ دەمایەوە.

نموونە دووەمیش شانۆنامەی (شالیر)(King Lear) کە تراژیدیایە. ڕاستەبوونی کارەکتەرێکی وەك بەهلوول لە تراژیدیادا شتێکی نامۆیە، بەڵام لەوەش نامۆتر ئەوەیە کە بەهلوول لە تراژیدیترین بەشی شانۆنامەکەدا رۆلێکی سەرەکی هەبێ، من پێم وایە شەکسپیر لەو باوەڕدابووە کە تراژیدیا دەکرێ کاریگەرترو بەهێزتر بکرێ بەهۆی تێکردنی فاکتەرێکی

کۆمیدی بەمەستی بەراوردکردن و خۆشی بەخشین بەهلوول وەك چۆن ( برادلی)ی لێکۆڵەرەوە نووسیویەتی (( یەکێکە لەسەر کەوتنەکانی شەکسپیر لە شانۆنامەی (شالیر)دا.

بیر لە تراژیدیای (شالیر)بکەوە بێ بەهلوول ئاخۆ دەیناسیتەوە؟! بێ گومان، نەخێر، هەرکە بەهلوول لە شانۆنامەکە دەرهێنرا ئەوا هاوسەنگی و حبکەی شانۆنامەکە تێکدەچێ.

بەهلوولەکەی شالیر زۆر لەوە گرنگترە کە ناوەکەی دەیگەیەنێ بە بەهلوول لەو کاتەدا دێتە سەر تەختەی شانۆ کە داروخانی دەروونی لیر لە سەرەتادایە و لە کۆتاییی بەشی دووەمدا ون دەبێ پاش ئەوەی ئەرکی سەرەکیی خۆی ئەنجام گەیاند. شایانی ئاماژە بۆکردنە بەهلوول، پاشا شێتەکەی خۆی بەجێ ناهێڵێ بەڵکو لەگەڵیدا دەمێنێتەوە، ئەمەش دڵسۆزی بەهلوول دووپات دەکاتەوە کە یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی بەهلوولی شانۆنامەکانی شەکسپیر.

سەبارەت بە زمانی بەهلوول لەم شانۆنامەیەدا دەبینین زمانێکی پاراوو درکی خواە ئامێز بەکاردەهێنی و بەردەوام یاری بەوشە دەکات و هەمووکارەکتەرەکانی تری شانۆنامەکە هیوا خوازن بتوانن بەشێوەی بەهلوول بدوێن.

لەم شانۆنامەیەدا بەهلوول لە تراژیدیای لیر دەگات بۆیە بەردەوام بەقسە گاڵتە ئامێزەکانی و بەزەییەوە هەوڵ دەدات ناخۆشییەکانی کەمتر بکاتەوەو دڵی بداتەوە. دوای شێتبوونی لیر سروشتی ژیرێتیی بەهلوول دەگۆرێت، چونکە بەهلوول پێی وایە ئامۆژگاری کردن درەنگە، بۆیە تەنیا هەوڵ دەدا دڵی لیر خۆش بکات و بەپێی توانا کارەساتە سایکۆلۆژییەکەی لەبیر بباتەوە، بەڵام وەك چۆن پرۆڤیسۆر ((تێرنەر)) نووسیویەتی (( هەوڵەکانی بەهلوول بێهوودە بوون، چونکە تازە کارلەکار ترازابوو)).

بەهلوول لەم شانۆنامەیەدا رۆڵێکی سەرەکی دەبینێ رۆڵەکەشی خۆشی بەخشین و بەراوردکاری و بەهێزتر کردنی تەنگەژە تراژیدییەکانی رووداوەکان. لەم شانۆنامەیەدا بەهلوول دەنگی ویژدانی شالیرە و بەردەوام لە مەترسییەکان ئاگاداری دەکاتەوەو ئامۆگاری دەکات بەم شێوەیەش بە تەواوی مەبەستانە دەپێکیت کەبۆی دەست نیشان کراوە.






## ((سەیدە)) لە (( کەوەکانی قەرەجوغ)دا

پێش هەموو شتێك بە پێویستی دەزانم بۆ ئەوە بکەم کە لەم زنجیرە تەلەفزیۆنییەدا کارەکتەری ((سەیدە)) بەهلوولی بەرهەمەکەیە و هونەرمەندی لێهاتوو و بە توانا ئیبراهیم حکیم رۆڵەکە دەبینێ. گومان لەوەدانییە کە بەهرەو ئەزموونی درێژ خایەنی ئەم هونەرمەندە زۆر شتی خستۆتە سەر تایبەتمەندیەکانی ئەم کارەکتەرە (سەیدە). لەم بەرهەمەدا.

## (سەیدە) رۆڵێکی نیمچە سەرەکی دەگێڕێ.

( تەلعەت سامان)ی نووسەر زۆر زیرەکانە ئەو کارەکتەرەی بۆ پێکانی مەبەستەکانی بەکارهێناوەو ژیرانە مامەڵەی لەگەڵ کردووە. بە ئاشکرایی دیارە کە جیاوازییەکی ئەتۆ لە نێوان بەهلوولەکانی شەکسپیر و سەیدەی ( تەڵعەت سامان)دا بەرچاو ناکەوێ لە رووی ئەرك و تایبەتمەندییەکانیان لە بەرهەمەکاندا، ئەگەر چاو لەو راستییە بپۆشین کە بەرهەمەکانی شەکسپیر بەرهەمی شانۆیین و بەرهەمەکەی تەڵعەت سامان بەرهەمێکی تەلەفزیۆنییە.

با لە سەرتادا مەبەستی دۆزینەوەی خاڵە لێکچوو و جیاوازەکانی نێوانیان با پێناسەیەکی کارەکتەری سەیدە بنوسیین بۆ ئەوەی لەگەڵ پێناسەی بەهلوولدا بەراورد بکرێ. سەیدە کارەکتەرێکە سەرچاوەی پێکەنینە، بەقسەکانی زۆرێك لە تەماشاکاران و تەنانەت کارەکتەرکانی نێو زنجیرەکەشی هێناوەتە پێکەنین. سەیدە، کارەکتەرێکی کورتە باڵایەو دەستە جلێکی کوردی پینەکراو و شڕی لەبەردایەو کڵاوێکی لەسەرە و چەند نوشتەیەك بە جلوبەرگییەوە لکێنراوە و بلوێرێکی لەدەست دایە.

ئەگەر بەراوردێکی پێناسە سەیدە لەگەڵ پێناسەی بەهلوولدا بکەین بۆمان دەردەکەوێ کە لێکچوونێکی زۆر هەیە لە نێوانیاندا، تەنیا بلوێرەکەی دەست سەیدە نەبێ کە پێم وایە خراوەتە سەری و لە جیاتی رەنگاو ڕەنگ جلوبەرگێکی کوردی کراوەتە بەر.

ئەگەر بێینە سەر ئەرکەکانی سەیدەی تەڵعەت سامان لەم بەرهەمەدا دەبینین لەم رووەشەوە لێکچوون لە نێوان سەیدەو بەهلوولەکانی شەکسپیردا زۆرە، ئەوەتا ئەرکی سەرەکی سەیدە سەربارەی دابینکردنی خۆشی و پێکەنین، بریتییە لە ئاراستەکردنی رەخنەی گاڵتەئامێز بۆ ئاغای گوندی ((ژاناوە))و پیاوەکانی، بەڵام لە ژێر پەردەی درکە و خوازە و یاری کردن بە وشەدا. ئەمەش رێك لەگەڵ ئەرکە سەرەکییەکانی بەهلوولەکانی شەکسپیر دەگونجێ.

تایبەتمەندییەکی تری بەهلوولەکانی شەکسپیر کە لە کارەکتەری(سەیدە)دا بەرجەستە کراوە مۆڵەتی قسەکردنی ئازادانەیە لە بەرهەمەکەدا. ئەوەتا سەیدە هەر قسەیەك لە دڵیدا هەبێ بێ سڵەمینەوە لە ئاغاو دارودەستەکەی دەیکا. بۆ نموونە کاتێ(( مەئموور)) دێتە گوندی ((ژاناوە)) و لەو کاتەی لە دیوەخانی قادر ئاغا دانیشتبوو بۆ قسەکردن لەگەڵ خەڵکی ئاوایی، سەیدە گاڵتە بە (( مەئموور) دەکاو قسەی ناشیرینی پێ دەڵێ.

**پاش ئەوە جەوهەری کوڕی قادر ئاغا خۆی لە سەید تووڕە دەکات.**

بەڵام ((مەئموور)) دەکەوێتە قسەو دەڵێ :

**((قەیدی ناکا سەیدە عەفووە، هەرچی دەرێ بابرێ)).**

یەکێك لە ئەرکەکانی تری سەیدە ئامۆژگاری کردنە، ئەوەتا لە یەکێك لە دیمەنەکانی (( کەوەکانی قەرەچوغ))دا سەیدە ئامۆژگاریی جەعفەری کوڕی قادر ئاغا دەکاو دەڵێ:

**((جەعفەر، ئەتو قەت وەکی جەوهەری نەکەی، ها،**

**دوایی خەرك ركی لێت دەبتەوە)).**

ئەمە ئامۆژگاریی سەیدە بۆ کوڕی ئاغا کە دەکاتە گەورەی سەیدە. ئامۆژگاری کردنی گەورەکانیان یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی بەهلوولەکانی شەکسپیر، ئالێرەشدا لە نێوان سەیدەو بەهلولەکانی شەکسپیردا لێك چوون بەدی دەکرێ.



سەیدە لەم بەرهەمەدا زمانێکی پاراو و درکەو خوازە ئامێز بەکاردێنێ و بەردەوام یاری بە وشە دەکات. لە سەراپای زنجیرەی ((کەوەکانی قەرەچوغ))دا بۆ سەلماندی ئەو راستییە نموونەمان زۆرن، بەڵام لێرەدا من تەنیا یەك نموونە دەخەمە بەرچاوی خوێنەری بەرێز. لە دیمەنێکی ئەو زنجیرەیەدا لەو کاتەی سەیدە لەگەڵ جەعفەری قادر ئاغاو کاکل و کۆمەڵێك لە خەڵکی ئاواییدا دانیشت بوو، ئەوە بوو جەوهەری قادر ئاغا لەگەڵ دارودەستەکەیدا کە ناویان شینەو سەرپان بوو هاتنەلایان هەرکە گەیشتنە لای ئەو کۆمەڵە خەڵکە سەیدە بە توانجەوە وتی:

**((ئۆی، ئەو هەورە ڕەشەی...))**

جەوهەری سەیری ئاسمانی کرد دنیا ساماڵ بوو، بۆیە بەسەر سوڕمانەوە وتی:

**(( کا هەوری ڕەش، کورە؟!)).**

سەیدە خۆی دەیزانی مەبەستی چی بوو، بۆیە وەڵامی دایەوە وتی:

**(( هەوری رەش زۆرن، زۆر بەس ئەنگۆ نایانبینن!!))**

ئەگەر تۆزێك لەم قسانەی سەیدە ورد بینەوە ئەوا دەتوانین بە ئاسانی بگەینە مەبەستی راستەقینەی سەیدە، کە بریتییە لە بەراورد کردنی جەوهەرو دارودەستەی بەهەورێکی ڕەش کە بەهۆی زوڵم و ستەمی بەردەوامیان لە خەڵکی دونیای ساماڵ و بێ گەردی هەژارانی گوندی ژاناوی تاریك کردووە. ئەمەش ئەو ڕاستییە دەسەلمێنی کە سەیدە زمانێکی پاراو و درکەو خوازە ئامێز بە کاردێنێ و یاری بە وشە دەکات ئەمەش تایبەتمەندییەکی بەهلوولی شانۆنامەکانی شەکسپیرە.

رەخنە گرتن و بەرچاو خستنی گەندەڵی و کەم و کوڕییەکانی خەڵکی بە گشتی و چینی دەوڵەمەند بە تایبەتی یەکێکە لەسەرەکیترین ئەرکەکانی سەیدە لەو بەرهەمەدا. ئەوەتا سەیدە کاتێ پیاوانی ئاغا خەریکی خواردنی بەرماوەی چێشتەکەی (مەئموور) بوون کە بەمریشك و پەلەوەری هەژاران بۆی ئامادە کرابوو، دوای ئەوەی لە بـــەشـــــداری کـــــــردنی بـەرماوەی چێشت رێگەی لێگیرا چوو لای ئاغا و سکاڵای خۆی کرد، بەڵام قادر ئاغا وتی:

**((ئەتوو لە برسان دەمری...))**

سەیدەی مۆڵەت پێدراو لەوەڵامدا وتی:

**((ئەمن لەبرسان نامرم، نا،**

ئەوانە (دارودەستەی ئاغا) لە برسان دەمرن)).

ئەو قسانەی سەیدە رەخنەگرتن و بەرچاو خستنی چاوچنۆکیی ئاغاو پیاوەکانی پیشان دەدات.

ئەگەر بێینە سەرباسی دڵسۆزی سەیدە ئەوا دەبیینین لەم بەرهەمەدا سەیدە بەرامبەر بە (کاکل) و خێزانەکەی کە دایکی و چەتۆ دەگەرێتەوە زۆر دڵسۆزە، ئەمەش لەوەدا دیار دەکەوێ کە سەیدە زۆری پێ ناخۆشەکە کاکل لەلایەن پیاوانی ئاغاوە لێی دەدرێت و زیاتریش زۆر هاتۆچۆیان دەکات و نانیان لەلا دەخوات.

ئەو شتەی کە لەم بەرهەمەدا زۆر سەرەنجی راکێشام ئەو بلوێری دەستی سەیدە بوو کە پێم وایە یەکێکە لەو زیادکردنانەی کە خراوەتە سەر تایبەتمەندییەکانی بەهلوولەکانی شەکسپیر. لەو باوەڕەدام کە تەلعەت سامان بۆ پێکانی مەبەستەکانی و خستە ڕووی بیرو بۆچوونە تایبەتییەکانی خۆی دەربارەی ژیان و تێگەیشتنی لە جیهانی دەوروبەری زۆر ژیرانە ئەو بلوێرەی بەکارهێناوە، دەبینین سەیدە هەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی بەرهەمەکە بایەخێکی لە رادەبەدەری بە بلوێرەکەی دەدات.

زۆر جار سەیدە بلوێر دەکاتە وەڵام بۆ ئەو پرسیارانەی ئاراستەی دەکرێت. لە دیمەنێکی بەرهەمەکەدا سەیدە دەڵێ:

**(( ئەمن لە جێی حکومەتی بم هەر**

**پۆلیسەو بلوورەکی دەدەمێ لە باتی چەك)).**

زیاتریش لە شوێنێکی تردا سەیدە دەڵێ:

**(( ئەگەر ساحێب بلوور بزانی بلوورەکەی بەباشی لێدا))**



## پەروایێز و سەرچاوەکان

١- "The new Encyclopedia Britanica"، Vol،IV، P.٢٢.

* بڕوانە: هیمداد عەبدولقەهار دۆڵەبەکرەیی، ((بەهلوول لە شانۆنامەکانی شکسپیردا، گۆڤاری کاروان، ژ١٢١، ساڵی ١٩٩٨، ل١١٢-١١٦.

٢- Manhem،M، " Notes about As You Like It"، P.٨٦.

٣- I bid. P.٩٦.

٤- Bradley، A.C، " Shakespearean Tragedy"، P.٢٥٩.

٥- Turner، W.، "King Lear".

? ئەو نموونانەی لەم زنجیرە تەلەفزیۆنەدا هێنراوەتەوە، لە ئەنجامی بینینی دووجاری تەواو زنجیرەکەیە لە کاتی پەخش کردنی لە تەلەفزیۆندا.

?*******

# شەکسپیرو هونەری بیستن

## میتافۆری ((گوێ)) لە ((ئۆتێللۆ)) دا

بێگومان ووشەی ووتراوو بیستراو بایەخێکی زۆری هەیە لە دروست کردنی جیهانە درامییەکانی شەکسپیر. بۆ گۆرینی تەختەی شانۆی ئەلیزابێتی بۆ ئەو هەموو دیمەن و شوێن و کاتە هەمەجۆرانەی شانۆنامەکانی شەکسپیر، دەبوو شانۆنووس چەند وەسفێکی ووشەیی (Verbal) سەبارەت بە کات، شوێن و کەشی ڕووداوەکان هەر لە ناو دەقی شانۆنامە بۆ تەماشاکارانی خۆی دابین بکات، بەڵام ئەو وەسفە ووشەییانە بەتەنیا بەس نیە بۆ تەواو کاریگەربوونی وەهمی (illusion) درامی چونکە پێویست بوو تەماشاکار هاوکات لەگەڵ بیستن بکەوێتە کار بە گوێرەی شتە بیستراوەکان.

ئەوەتا لە پێشەکی شانۆنامەی ( هێنری پێنچەم) (Henry V) ئەکتەرێك ڕوودەکاتە تەماشاکەران دەلێت:

**(( بەهۆی بیرۆکەکانتان کەم و کورییەکانمان پڕ بکەنەوە،**
**کارێکی وابکە کە دەنگی پێیەکانی لە گوێتان دا بزرنگێتەوە...**
**چونکە بیرۆکەکانی ئێوەیە کە دەبێ ئێستا پاشاکانمان بڕازێنێتەوە)).**

کەواتە بیستن ئینجا بینین بنەمای بنەڕەتین بۆ پتەوکردنی پەیوەندی نێوان شانۆ و تەماشاکار لە شانۆی شەکسپیر دا بە تایبەتی ئەگەر تەماشاکار بیەوێت بەتەواوی لەوەهمی درامیی بگات و تەختەی شانۆ بکاتە جیهانێك. ئەوەی لیر داوای دەکات لە گلۆستەری کوێر ئەنجامی بدات، بەهەمان شێوە تەماشاکارانیش پێویستە ئەنجامی بدەن. شالیر دەڵێت:

**((مرۆڤ دەتوانێ بزانێ چۆن جیهان بەرێوە دەڕوات بێ ئەوەی چاوی ببینێ، بە گوێیەکانت سەیرکە!))**

ئەو شتەی کە بەتەواوی نازانرێ بریتییە لە ڕادەی پشت بەستنی شەکسپیر بە پرۆسەی دروست کردنی وەهم لە ڕێگەی وەسفی وشەییەوە، کە بەشێکی بنەڕەتییە لەو پرۆسە درامییەی کە ئێمەی تەماشاکار یاخود خوێنەر دەیبیستین و دەیبینین و لە پێش چاومان پەردەی لەسەر هەڵدەدرێتەوە. یەکێك لە کارەکتەرەکانی شەکسپیر لە شانۆنامەی (خەوی نیووە شەوێکی هاوین) لە بەشی چوارەم دیمەنی یەکەمدا دەڵێت:

**(( چاوەکانی مرۆڤ گوێیان لێ نەبوو،**
**گوێیەکانی مرۆڤ نەیانبینی...**
**خەونەکەم چی بوو)).**

لەبەر ئەو هۆیانە دەبێ بایەخێکی تایبەتی بدەین بە ئەرکی بیستن لە شانۆنامەکانی شەکسپیردا، چونکە کرداری بیستن و گوێ دەبنە هۆی دابین کردنی سەرچاوەی سەرەکی وەسف (Imagery) و هەروەها پاڵنەری کردار لە زۆربەی بەرهەمەکاندا.

لە جیهانە درامییەکانی شەکسپیردا کرداری بیستن دەبێتە هۆی بەرەو پێش بردنی نەخشەی (Plot)ی بەرهەمەکە. گوێ دەتوانێ لە ئەرکدا یەکسان بێت لەگەڵ زمانی پڕ خوازەو درکە لە بەرهەمی ئەدەبیدا. بۆ نموونە لە شانۆنامەی (هاملێت)دا باوکی میر دەکوژرێت پاش ئەوەی کلاودیۆس (Claudius) لە ڕێگەی گوێیەوە ژەهراوی دەکات. بەهەمان شێوەش خاتوو ماکبێت (Lady Macbeth) لە شانۆنامەی (ماکبێت) دا دوای بینینی ئەو نامەیەی کە تێیدا باس لە سەردانی مێردەکەی دەکات بۆلای سێ جادووگەرەکە (Three Witches) بڕیار دەدات کە نەخشەیەك دابنێت بۆ ئەوەی بیرۆکەکانی بخاتە ناو گوێی ماکبێت بە هۆی ڕەوانی زمان و بوێری ئەو تەگەرانە لابدرێت کە لەوانەیە بێتە سەر ڕێگای.

سایکۆلۆژیەتی سەردەمی ڕێنیسانس ئەوەی دووپات کردۆتەوە کە لە نێو هەستەکانی مرۆڤ دا هەستی بیستن بە چاکترین هەست دادەنرێت بۆ پشتبەستن پێی بۆ زانینی ڕاستییەکان



چونکە کەمتر فریو دەدرێت لە هەستی بینین کە لە هەندێ کاتدا دەتوانرێت بەهۆی چەند کردارێکی ساختە فریو بدرێت. گوێ بریتییە لە ڕێگەی سەرەکی دروست کردنی وەهمی درامیی کە بەرهەمەکەی لەسەر بەندەو ئامێری ئەو وەهمەیە کە دەبێتە هۆی دروست بوونی چەندین وێنەو خەیاڵ لەلایەن کارەکتەرەکان دەربارەی ڕاستییەکان کە ناگونجێت لەگەڵ ئەو واقیعەی کە تەماشاکەر پێی ئاشنایە. لە شانۆنامە کۆمیدییەکان دا، بەهەڵە ئاڕاستەکردنی بیستن دەبێتە هۆی سەرەکی چارەسەری کۆتا- خۆشی ڕووداوەکان. بەڵام لە تراژیدیاکان دا بەشێوەیەکی حەتمی دەبێتە هۆی داڕووخانی کارەکتەرە فریودەرەکان.

ئەمەش لە شانۆنامەی (ئۆتێللۆ) دا زۆر بەزەقی دیارە بە تایبەتی کاتێك (دیاگۆ) جیهانی وەهمی ووشەیی بە شێوەیەکی هێندە سەرکەوتوو دروست دەکات کە ئۆتێللۆ ئەو شتانە لە دیاگۆ دەیانبیستێ دەیانخاتە شوێنی ئەوانەی کە بەچاوی خۆی دەیانبینێ. بەردەوام نەخشەو پیلانەکانی دیاگۆ بەرەو پێش دەچێت چونکە دەتوانێ بەهۆی ووشەکانییەوە ئەو جیهانە بگۆڕێت کە ئۆتێللۆ دەیبینێت.

**-١-**

ئاشکرایە کە (ئۆتێللۆ) شانۆنامەیەکە سەبارەت بە درکاندن و بیستنی ووشەکان لە سەرەتادا لەلای دیاگۆ ناوبانگی کاسیۆ وەك جەنگاوەرێك تەنهاخۆهەڵکێشانە و کرداری لەگەڵ دانییە. پاش ئەوەی دیاگۆ چەند جارێك داوا لە ڕۆدریگۆ دەکات کە باوکی دێزدەمۆنا بە ئاگا بهێنێت، ئۆتێللۆ دیاگۆی ئالآهەڵگر دڵنیا دەکاتەوە کە سکالآی باوکی دێزدەمۆنا پووچەڵ دەکاتەوە. لەو لێپرسینەوەی کە دواتر ئەنجام دەدرێت هەرچەندە ئۆتێللۆ بەسەردار (Duke) و پیاوماقوڵانی (Senate) ڤینیسیا ڕادەگەیەنێت کە ئەو لەقسەکردندا زۆر زیرەك نییە بەڵام سەردار داوای لێدەکات کە قسە بکات. ئۆتێللۆ قسەکانی ئاڕاستەی گوێیە هەستیارەکانی سەردار و پیاو ماقوڵان دەکات و لە قسەکانیدا وا دەردەکەوێت کە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکانی ئۆتێللۆ ببونە هۆی بنەڕەتی لە سەرنج ڕاکێشانی دێزدەمۆنا و دواتریش خۆشەویستی نێوانیان.

ئۆتێللۆ لە قسەکانی بەردەوام دەبێت و داوا لە سەردار دەکات کە بانگی دێزدەمۆنا بکات بۆ ئەوەی لە زاری ئەو راستییەکان بزانێ. باوکی دێزدەمۆنا خۆزگەی دەخوازێت کە منداڵێکی تری بەخێو کردبوایە نەك ئەو کچەی خۆی.

بەم شێوەیە شانۆنامەکە بە کۆمەڵە دەنگێکی دژ بەیەك دەست پێ دەکات کە بوونەتە هۆی دروست کردنی ژاوەژاوێك بە مەبەستی دابین کردن چەند گوێیەکی جۆراوجۆر بۆ بیستنیان لە کاتێکدا کە کارەکتەرکان لە میانەی وەسفە ووشەییەکانەوە دەیانەوێت کۆنترۆڵی ئەوە بۆچوونە واقیعییە بکەن کە هەموو کارەکتەرکان پێی ڕازی بن. برابانتیۆ (Brabantio) باوکی دێزدەمۆنا بە گومانە لە هێز و کاریگەری ووشە بۆیە دەڵێت:

**(( ووشە هەر ووشە، هەرگیز نەم**
**بیستووە کە بەهۆی گوێوە دڵێك ببردرێت)).**

بەڵام ئەوەیش کاریگەری ووشە بیستراوەکانی پێوە دیارە بە تایبەتی چیرۆکە هەڵبەستراوەکانی دیاگۆو رۆدریگۆ سەبارەت بە پەیوەندی نێوان دێزدەمۆنا و ئۆتێللۆ.

هەڵبەتە یەکێك لەو دەنگە بەرچاوانەی کە دەیانەوێت بەڵگە ووشەیی خۆیان پیشان بدەن دەنگی دیاگۆیە. لەسەرەتادا رۆدریگۆ دەڵێتە دیاگۆ:

**هەرگیز پێم مەڵێ**

((دیاگۆ)) لە وەڵامدا دەڵێت :

**(( گوێت لە من نابێت)).**

بەڵام دیاگۆ هەموو پیلان و نەخشەکانی بە ئێمە تەماشاکارو خوێنەر ڕادەگەیەنێت و دەبیسترێت، بە درێژایی ئەو شانۆنامەیە دەنگێکی زاڵە لەسەر تەختەی شانۆ. تەنها لە کۆتایی شانۆنامەکە دروست کراوە ووشەییەکانی دیاگۆ بەهۆی وەسفە ووشەییەکانی ئیمیلیای خێزانی رەت کراوەتەوە. لەو کاتەوە دیاگۆ سوێند دەخوات کە تەنانەت تاکە ووشەیەکیش نەدرکێنێت. لەلای کارەکتەرەکانی تری شانۆنامەکە، ووشە تەنها بۆ مەبەستی پەیوەندی بەیەکتر کردن و گواستنەوەی پەیام بەکارهاتووە، تەنها دیاگۆ نەبێت کە بەهۆی هێزو



کاریگەری ووشەکانی زاڵ دەبێت بەسەر ژیانی کارەکتەرکانی تری بەرهەمەکە. بۆ نموونە لە بەشی دووەم دیمەنی یەکەمی شانۆنامەکە دیاگۆ دەبیستێ کە کاسیۆ دەستی دێزدەمۆنا ماچ دەکات، یەکسەر ئەم کردەوە بەووشەکانی خۆی دادەرێژێتەوەو دەڵێت:

**((... من تەنانەت لەسەرەداوێکی بچووك**
**دەتوانم مێشیکی بەقەد کاسیۆ بگرم)).**

پێش ئەوە کاتەش دەبیستین کە دیاگۆ خەریکی دارشتنی پیلانێکە لە رێگەی ووشەوە بۆ تۆڵەسەندنەوە لە ئۆتێللۆو گەیشتن بە مەرامەکانی. دیاگۆ رێگەی بیستن دەگرێتە بەرو هێرشی پێ دەباتە سەر گوێی ئۆتێللۆ بەمەش بەیەك بەرد دوو نیشان دەپێکێت. کاتێ جیهانە ووشەیەکی دیاگۆ روونتر دەبێتەوە دووبارە لە بەشی دووەمی شانۆنامەکە دیاگۆ جەخت لەسەر رێگەی بیستن دەکاتەوەو دەڵێت:

**((... لە کاتێکدا ئەو گەمژەیە ( کاسیۆ) لە خزمەتی دێزدەمۆنا دەستەودامێن ئەبێ بۆ مەیسەر کردنی ئیشەکەی ئەوەیش لەلای ئۆتێللۆ دەستەو نزا دەبێتەوە بۆ ئەو کاتە نۆرەی ئەوەدێت کە منیش ژەهرەی کوشندەی گومان بکەمە گوێی ئۆتێللۆ، بۆی روون دەکەمەوە کە پەیوەندی و میانەکی گومان لێکراو لە نێوان کاسیۆو خانمدا هەیە، ئەو کۆششە دێزدەمۆنا دەیکات بەخۆرایی نییەو شتێکی شاراوەی خراپی لە دووتوێدا حەشارداوە...))**

-٢-

پاشان لەووتەیەی کە دیاگۆ بەڵێن دەدات کە گوێی ئۆتێللۆ ژەهراوی بکات، ئاماژە بۆ ئەو کردارە ووشەییە  چاوەڕوانکراوەی دەکات بە جۆرێك کە هەردوو پاڵنەری درکاندن و بیستن دەبەستێتەوە بەرێرەوی سەرەکی رووداوەکانی شانۆنامەکە.(ئۆتێللۆ) شانۆنامەیەکە دەربارەی تێکدانی ژن هێنانێك. شانۆنامەکە بە ڕاگەیاندنی ئەو ژن هێنانە دەست پێ دەکات و بەمردنی ژن و مێردەکە کۆتایی دێت لەسەر ئەو جێگەیەی کە شەوی یەکەمیان لەسەر بەسەربرد. دیاگۆ پێی وایە کە ژەهراوی کردنی گوێی ئۆتێللۆ دەبێتە هۆی لە دایك بوونی ئاژەڵێکی ترسناك کە حەسودی (Jealousy). هەر لەو کاتەداو لەبەشی دووەمدا دیاگۆ ئۆتێللۆ هۆشیار دەکاتەوەو دەڵێت:

**(( گەورەم ئاگاداربە لە دڵ پیسی، دڵ پیسی ئاژەڵێکی چاو- سەوزە لەسەر گۆشت دەژییێت)).**

ئینجا لەو شەوەی کە دێزدەمۆنای تێدا دەکوژرێت، ئەو دووپات دەکرێتەوە کە دیاگۆ پیلانەکەی خۆی سەرکەوتووانە ئەنجام داوەو لە دایك بوونی ئەو ئاژەڵە دەردەخات لە زیاتر لە ڕوویەکەوە.

ئاشکرایە کە ژەهراوی کردنی گوێی ئۆتێللۆ دەبێتە هۆی لە دایك بوونی ئەو ئاژەڵە لە دەقی ئەم شانۆنامەیەدا چەند ئاماژەیەکی سێکسی هەیە و ئەوە دەگەیەنێت کە پەیوەندییەك لە نێوان دیاگۆ و ئۆتێللۆدا هەیە کە پێچەوانەیە لەگەڵ ئەو پەیوەندییە لە نێوان ئۆتێللۆ و دێزدەمۆنادا بەدی دەکرێت. بەم جۆرەش زمانی دیـــاگـــۆو گـــوێی ئۆتێللۆ دەبنە دوو ئەندامی دروست کردنی نەوەیەکی نۆی. دیاگۆ وەك هاوبەشی بیستن- سێکس (Sexual-Aural ) ئۆتێللۆ دێتە بەرچاو. بەم شێوەیەش ووشەکانی دیاگۆ دەبنە تۆوی سك پڕی بۆ مێشك و هۆشی ئۆتێللۆ لە ڕێگەی گوێییەوەو لە ئاکامدا ئەو ئاژەڵە چاوسەوزە - دڵ پیسییە- لە دایك دەبێت.

هەندێك لە ڕەخنەگرو لێکۆڵەرەوە وەك ( ولیەم تول، ئێدگار هایمان) باسیان لەو حاڵەتانە کردووەو لەو باوەڕەدان کە فریودانی ئۆتێللۆ لەلایەن دیاگۆ وەك پەلامارێکی



سێکسی وایە، ئەوەی لێرەدا من گرنگی پێدەدەم ئەوە کە چۆن شەکسپیر ئەو وەسفە ووشەییانەی بەکارهێناوە بۆ پێناسەکردنی واتاکانی ڕێگەی بیستنی دیاگۆ بۆ کۆنترۆل کردنی بۆچوونی ئۆتێللۆ بەرامبەر واقیع، هەروەها بۆ دامەزراندنی پەیوەندی لە نێوان ئەو ڕێگەیەو تێکدانی ژن هێنانی ئۆتێللۆ کە گەوهەری شانۆنامەکەیە. ئەگەر شانۆنامەی (ئۆتێللۆ) تایبەت بێت بە ڕق و خۆشەویستی، وەك چۆن هەندێك رەخنەگر پێیان وایە، ئەوا بێ گومان باس لە هێزو کاریگەری ووشە دەکات بۆ ڕێکخستنی واقیع و ڕاستییەکان و پێناسە کردن و تێکدانی ئەو پەیوەندییە مرۆڤانەیەی کە بەهۆی چەند هەستێك دروست کراوە. دەبێ ئەوەش لەیاد نەکەین کە لە شانۆنامەکەدا هۆشی ئۆتێللۆ بەهۆی لە دایك بوون نەك منداڵدانی نەزۆکی دێزدەمۆنا.

-٣-

لەژێر ڕۆشنایی جۆرەکانی پەیوەندی کە دروست کراون و تێکدراون بە هۆی ڕێگە ووشەییەکەی دیاگۆ، زۆر لە دیمەنە سەرەکییەکانی شانۆنامەکە دەتوانرێت بە بۆچوونێکی نۆی لێك بدرێتەوە یەکێك لەو دیمەنانەش دەکەوێتە بەشی سێیەم و تێیدا ئۆتێللۆ دێتە سەرچۆك و سوێند دەخوات کە تۆڵەی ڕەوای خۆی بستێنێتەوە. ئەمەش بە شێوەیەك وەسف کراوە کە ژن هێنان بێنێتەوە یاد، چونکە دیاگۆش لەم بەشەداو لە دیمەنی سێیەم دێتە سەرچۆك و سوێند دەخوات و دەڵێت:

(( ئەی ڕووناکییە بڵند و ڕۆشنەکانی ئاسمان کە هەتا هەتایە دەسوتێن و دەدرەوشێنەوە.. ئێوەش ئەی ئەو شتانەی چوار دەورتان گرتووین ئاگاداربن و گەواهم بن، ئەوەی من دەمەوێ بیکەم بۆ ئەوەی بەرگری لەشەرفی ئۆتێللۆ بکەم.. با ئۆتێللۆش بفەرموێت فەرمان دەربکات بزانن چۆن بەبێ دوودڵی بەجێی دەهێنم ئەگەر کارێکی خوێناویش بێت...)).

شایانی ئاماژە بۆ کردنە کە لەم شانۆنامەیەدا پێشتر زەمینە خۆش کرابوو بۆ ئۆتێللۆ بۆ ئەوەی ڕۆڵی ((مێ)) یاخود ناچالاکی (Passive) بگێرێت لەو پەیوەندییە نوێییەدا. لە دیمەنی دووەمی بەشی سێیەم دا دیاگۆ بە کاسیۆ رادەگەیەنێت کە :

**((خێزانی سەرکردەمان ئێستا سەرکردەی راستەقینەیە)).**

دەبێ ئەوەش لە یاد نەکەین کە کرداری ژەهراوی کردنی گوێی ئۆتێللۆ لەبەر ئەوەی لە ڕۆژدا روویدا لەبەر ئەوەی تەنها رووداوی گرنگە کە بەرۆژ رووبدات بۆیە دەبێتە هۆی پێچەوانەیەك بۆ شەوی بووك گواستنەوەی ئۆتێللۆ.

ئەنجامی ژەهراوی کردنی گوێی ئۆتێللۆ لەلایەن دیاگۆوە بووە هۆی ئەوەی کە ئۆتێللۆ جیهان بەو ووشە قەدەغە (Taboo) سێکسییانە وەسف بکات کە دیاگۆ لەسەرەتای شانۆنامەکە دەیانخاتە روو. لەبەشی یەکەمی شانۆنامەکەدا کاتێك دیاگۆ وەسفی پەیوەندی نێوان ئۆتێللۆ و دێزدەمۆنا دەکات بۆ باربانتیۆی باوکی دێزدەمۆنا لە رێگەی چەند ووشەیەکی نارێك و ناشیرینی سێکسی ئەو راستییە تەواو دەردەکەوێت. بە هەمان شێوە دیاگۆ لە کاتی وەسف کردنی پەیوەندی هەڵبەستراوی نێوان کاسیۆ و دێزدەمۆنا پەنا دەباتە بەر بەکارهێنانی چەندین ووشەی ناشایستە لەو کاتەدا کە ئۆتێللۆ دەست دەکات بە وەسف کردنی جیهان بە هۆی ئەم ووشانەوە، ئەوە دەردەکەوێت کە ئۆتێللۆ بە تەواوی کەوتۆتە داوی فریودانی ووشەیی دیاگۆ، چونکە دەبینین ئۆتێللۆ هەمان بۆچوونی دیاگۆی هەیە بەرامبەر بە جیهان کە ئاراستەی گوێی کراوە بە مەبەستی دروست کردنی واقعێکی ساختە لەبەردەم ئۆتێللۆ.

پاش ئەوەی ئۆتێللۆ ووشەو بۆچوونەکانی دیاگۆی سەبارەت بەجیهان وەرگرت، تەنها پاش ماوەیەکی کەم بەرەنگاری و ریسواکردنی دێزدەمۆنا دەست پێ دەکات بە ووشەی وەك ناپاك، سۆزانیی وەسف دەکات. زیاتریش لەبەشی پێنجەم دیمەنی دووەمدا پێی دەڵێت:

**((دەبێ بمریت، بۆ ئەوەی چیتر پیاو فریونەدەیت))**

بەڵام ئەوەی دوایین دیمەنی شانۆنامەکە بەهادارتر دەکات ئەو ڕاستییەیە کە ئۆتێللۆ خۆی ناپاکی کردووە، چونکە سەرنج و گوێ بۆ دیاگۆ شل کردووە، کە دەبوو بۆ دێزدەمۆنا بێت.

بەشی سێیەم و چوارەمی شانۆنامەکە پێکهاتووە لە درێژەپێدانی ململانێ و رکابەری لە نێوان دیاگۆو دێزدەمۆنا بەمەبەستی راکێشانی سەرنج و دابین کردنی گوێی ئۆتێللۆ بۆ ووشەکانیان. هەردووکیان زۆربەی کاتیان بەقسەکردن لەگەڵ ئۆتێللۆ بەسەر دەبەن دەربارەی



کاسیۆی یاوەر دوورخراوە لە کار. دێزدەمۆنا چەند جارێك داوا لە ئۆتێللۆ دەکات کاسیۆ بگێرێتەوە سەر کارەکەی بەڵام لەبەر ئەوەی ووشەکان بە چاکی بەکارناهێنێ بۆیە ئەمە بووە هۆی سوتەمەنی خستنە سەر ئاگری گومانی ئۆتێللۆ. چونکە ئۆتێللۆ تەنها خەریك بوو بە پاکیی و دڵسۆزیی دێزدەمۆنا. لە ئەنجامدا دیاگۆ سەردەکەوێت لە قەناعەت پێ هێنانی ئۆتێللۆ ئەمەش بە هۆی چیرۆکی دەستە سرەکە و کاسیۆ.

**-٤-**

شانۆنامەکە بە کۆتا دێت بەوەی کە ئۆتێللۆ تەنها گوێ لەقسەکانی دیاگۆ دەگرێت. لە دوایین دیمەندا دێزدەمۆنا چەند جارێك ڕاستییەکان بە ئۆتێللۆ رادەگەیەنێت بەڵام ئۆتێللۆ تەنها گوێ لەو ووشانە دەگرێت کە دیاگۆ گوێی بۆ بیستنیان ئامادە کردووە. هەروەها بەرگرییەکانی دێزدەمۆنا لە پاکێتی خۆی وەك قسەی ئافرەتێکی ناپاك و سۆزانی گوێیان لێدەگیرێت. سەبارەت بەکاسیۆ کە دەتوانێ گەواهی لە بەرژەوەندی دێزدەمۆنا بدات بە هۆی کردەیەکی دیاگۆ دەمی دەگیرێت- دەکوژرێت. لە کۆتاییدا دێزدەمۆنا داوای دواخستنی کوشتنی دەکات لە ئۆتێللۆ تکای لێدەکات بۆ ئەوەی دەسەڵاتداران گوێیان لێی ببێت. لەو کاتەدا ئۆتێللۆ هێندەی بیستبوو کە بەس بێت بۆ کوشتنی دێزدەمۆنا و دەیکوژێت.

ئەوەی کۆتایی شانۆنامەکە ترسناك تر دەکات بریتییە لەو راستییەی کە دیاگۆ، بەلایەنی کەم بە شێوەیەکی میتافۆری، پاك و دڵسۆز نەبوو لە پەیوەندییەکەی لەگەڵ ئۆتێللۆ. لەبەشی دووەمدا دیاگۆ بەڵێن دەدات کە کاسیۆ لەخشتەبەرێت و رەشی بکات لەبەر چاوی ئۆتێللۆ. ئەوەتا لەبەشی سێیەم دا وا دەردەکەوێت کە بەڵێنەکەی هێناوەتە جێ کاتێك کە چیرۆکی هەڵبەستراوی گێرانەوەی خەونەکەی کاسیۆ باس دەکات و دەڵێت:

**((... لەم شەوانەدا لە تەك کاسیۆ بەیەکەوە ماینەوە... ئەو شەوەش ددان ئێشە خەوی زڕاندبووم.. شەو درەنگ بوو.. ئەوا سەیرم کرد کاسیۆ خەون دەبینێ و ورێنە دەکات، خەڵکی وا هەن نهێنییەکانیان بەدەم خەوەوە دەگێرنەوە... جا ئەو هاورێیەمان لە پرخەی خەودابوو دەیووت:( دێزدەمۆنای خۆشەویست، نازدارەکەم با ووریا بین ئاگاداری**

**خۆمان بین و کەس بەم خۆشەویستییەمان نەزانێ. ئیتر دەستی گرتم و گوشی... پاشان کەوتە خۆ تێ هەڵسون و لێستنەوەم. لاقی هاویشتە سەر ڕانم و دەستی کردە ملم.. ئینجا ووتی نەفرەت لەو شانس و ناوچەوانەی کە تۆی بەو مەغرببییە ڕەوا بینی...))**.

لە ژێر هێرشی دیاگۆ بۆ سەر گوێی ئۆتێللۆ ، ئۆتێللۆ ڕازی دەبێت بە هەموو ئەو وەسفە ووشەییانەی کە دیاگۆ سەبارەت بە واقیع دەیاندرکێنێت، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە فریودانە سامناکەکانی دیاگۆ ببن بەو واقیعەی کە ئۆتێللۆ پشتی پێ دەبەستێت لەبەرەنگاری بوونەوەی و دواتر تێکدانی پەیوەندییەکەی لەگەڵ دێزدەمۆنا.

**–٥–**

وەك لەسەرەوە ئاماژەی بۆ کرا (ئۆتێللۆ) شانۆنامەیەکە کە باس لە تێکدانی ژن هێنانێك دەکات. لە کاتێکدا کە پەیوەندی هەمەجۆر لە نێوان کەسایەتیەکانی شانۆنامەکە پەیدا دەبێت بە هەمان شێوە پەیوەندی نێر- مێ پەیدا دەبێت، لە هەمان کاتدا زۆر پەیوەندی نێر-مێ لە شانۆنامەکەدا تێك دەچێت. هەڵبەتە سەرەکیترین ئەو پەیوەندییانە لە نێوان ئۆتێللۆ و دێزدەمۆنا بەرجەستە کراوە. بەڵام زۆر نموونەی تریش هەیە، دیاگۆ زیاتر لە جارێك رادەگەیەنێت کە ئەوە پێی وایە ئۆتێللۆ لەگەڵ ئیملیای خێزانی ناپاکی کردبێت. لە کۆتاییدا ژن هێنانی دیاگۆش بە تەواوی تێك دەچێت دوای ئەوەی ئیمیلیا ساختەکاری و فڕوفێڵەکانی ئاشکرا دەکات بەهۆی دابین کردنی زانیاری ووشەیی لە گفتوگۆی نێوان ڕۆدریگۆ لەگەڵ هەریەکە لە دیاگۆ و باربانتیۆ لە سەرەتاکانی شانۆنامەکە بۆمان دەردەکەوێ کە ڕۆدریگۆ پێش دەست پێکردنی شانۆنامەکە یەکێك بووە لە داخوازی کارە ڕەت کراوەکانی دێزدەمۆنا. بەڵام لەو کردارنەی کە وەسف کراون لە شانۆنامەکە وا پێدەچێ ڕۆدریگۆ هەوڵ بدات بەهاوکاری دیاگۆ بۆ رازی کردنی دێزدەمۆنا بۆ ئەوەی ناپاکیی لەگەڵ مێردەکەیدا بکات. لەو کاتەدا لای ڕۆدریگۆ دێزدەمۆنا وەك هەر کەل و پەلێکی ئاسایی دەکڕاو دەفرۆشرا. بە هەمان شێوەش کاسیۆ سەیری بیانکای دەکرد چونکە لە شوێنێکی شانۆنامەکەدا دیاگۆ پێمان دەڵێت:



**(( کاسیۆ هەر کاتێك بێ کاربێت پێی رادەبوێرێت (بیانکا)، بەهیچ جورێك رازی نابێت کە بیخوازێت))**.

ئەو راستییە ئیمیلیاش دەگرێتەوە چونکە لە شوێنێکدا بە دێزدەمۆنا رادەگەیەنێت کە لە هەندێ بارودۆخی تایبەتیدا لەوانەیە ئەویش ناپاکی لە دیاگۆی مێردی بکات. تەنها کەس لە شانۆنامەکە کە باوەڕی بە پاکی پەیوەندی ژن و مێردایەتی هەبێت دێزدەمۆنایە.

**–٦–**

گۆمان لەوە دانییە کە کرداری بیستن پاڵنەری بنەرەتییە لەو جیهانە درامییەی کە شەکسپیر دروستی دەکات لە شانۆنامەی ( ئۆتێللۆ)دا. زۆربەی شانۆنامەکە بریتییە لە ململانێ و بەربەرەکانی لە نێوان چەند دەنگێ. بە هێزی دیاگۆ دەردەکەوێت لە هەبوونی توانای ڕێکخستنی ئەو واقیعەی کە لەلایەن ئۆتێللۆوە دەبینرێت ئەمەش لە ڕێگەی دابین کردنی گوێ بۆ ئەو ووشانەی کە ئەو دەیاندرکێنێت جگە لە دەنگی کەسانی تر. شانۆنامەکە بە بیستنی چەند کێشەیەك لەبەردەم سەردار و پیاو ماقوڵانی ڤینیسی دەست پێ دەکات. لێرەشدا دیاگۆ دەدۆرینێ وەك چۆن لە کۆتایی دەدۆرێ کاتێ ئیمیلیای خێزانی پەردە لەسەر ساختەکاری و درۆ هەڵبەستراوەکانی هەڵدەماڵێت، بەڵام ئەمە دووحاڵەتی بیستنی گشتین. کاتێك دیاگۆ بە تەنها بۆ یەك گوێ قسە بکات هیچ هاوتایەکی نییە لە بەتوانایی بۆ ئەوەی ببیسترێت. ئەو زاراوە سێکسییانەی کە بە هۆیەوە نەخشە ووشەییەکانی پێ دادەرێژێت هاوشانە لەگەڵ ئەو تایبەتییە سێکسییەی ئەو پەیوەندییەی کە دەیەوێت تێکی بدات. پەیوەندی نێوان دیاگۆو ئۆتێللۆ دەبێت هۆی پێچەوانە کردنەوەی پەیوەندی نێوان ئۆتێللۆ و دێزدەمۆنا. ئەمەش دەبێتە هۆی تێکچوونی سێگۆشەی هەتا هەتایی خۆشەویستی و هەروەها کەمتر کردنەوەی ململانێی بەرهەمەکە بۆ هەڵبژاردنی ئۆتێللۆ لە نێوان دیاگۆو دێزدەمۆنا.

لە کۆتاییدا دەبێ ئاماژە بۆ ئەو راستییەش بکەین کە چەندین لێك چوونی هەیە لە نێوان دیاگۆی چنەری داوی ووشەیی کە هەموو کارکتەرەکانی پێ دەگیرێت و شەکسپیری شانۆنووس کە داوای ووشەییەکەی بریتییە لە سەرتاپای شانۆنامەکە. هەر کە کارەکتەری

زیاتر و زیاتر دێنه سەر تەختی شانۆ لەسەر بنچینەی ئەو ووشە زانیارییانەی کە بە هۆی بیستنی دیاگۆ دابین دەکرێت بەم شێوەیەش ئێمەی تەماشاکار و خوێنەر وەڵامی شانۆنامەکەی دەدەینەوە بە پشت بەستن بەو ووشانەی کە لە شانۆنووسەکە خۆی دەیبیستین. ئێمە لەلای دیاگۆوە فریوە نەدراوین بەڵام تەنها لەبەر ئەوەی زیاتر لە هەموو کارەکتەرەکانی تر قسەدەکات دیاگۆ دەبینین و دەبیستین و بەنەخشەو پیلانە فریودەرەکانی ئاشناین، هەروەها لە دوای ئەویش دێزدەمۆنا دێت.

بەڵام تەکنیکی پیشاندان چوون یەکە، چونکە دیاگۆ لایەنی تاریکی شانۆنووس دەنوێنێت و ئەو کەسەی کە بە ئامانج و مەرامێکی خراپ فریومان دەدات لە جیاتی ئەوەی تەنها چیرۆك بخولقێنی بۆ مسۆگەر کردنی گونجاوی رووداني شانۆنامەکە. بە هەمان شێوە ( کارەکتەر — شانۆنووس) کە لە شانۆنامەکانی تری شەکسپیردا بەدی دەکرێن، دیاگۆ پێمان دەڵێت: کە هونەر تەنها خەیاڵە و ژیان نییە. ئەگەر شتێك سەبارەت بە ژیان لەو شانۆنامەیەدا فێرببین ئەوا بێگومان هێزو کاریگەری ووشە فێردەبین بۆ خولقاندنی خەیاڵ بەهەر دوولایەنی خراپ وەك دیاگۆ و لایەنی چاك وە شەکسپیر. ئەوەماوە کە بڵێین لە میانەی ئەو شانۆنامەیدا شەکسپیر زۆر کارەکتەری بەهیزو بە توانامان دەخاتە بەرچاو وەك دیاگۆ و ئۆتێللۆ واین لێدەکات کە لە کەسانی ژیانی راستەقینە بچن و بەربەرەکانیی یەکتر بکەن، بەڵام هەرگیز لەبیری ناچێت کە پێمان رابگەیەنێت ئەوانە تەنها بە هۆی ووشەی بیستراو ململانێ دەکەن

### سەرچاوە


کتێب: Shakespeare Quarterly

بەرگی:Vol.٣٠، Number ٣ ، ١٩٧٩

ناوی بابەت: Shakespeare's Aural Art The metaphor of Ear in Othello

نووسەری بابەت: John N. Wall

لاپەڕە: ٣٦٦-٣٨٥




## بونیادی درامی یۆلیۆس قەیسەری شەکسپیر

بێگومان (یۆلیۆس قەیسەر) یەکێکە لە تراژیدییە مێژووییە بەناوبانگەکانی شەکسپیر کە تێیدا بلیمەتی و لێهاتوویی نوسەری ئەو شانۆنامەیە بە زەقی بەدی دەکرێ، سەرەڕای ئەو راستییەی کە شەکسپیر چیرۆکی سەرەکی شانۆنامەکەی لە (پلوتارخ)[1]ی مێژوونووس وەرگرتووە چیرۆکی شانۆنامەکە دروست کراوی دەستی شەکسپیر خۆی نەبوو جگە لەولابردن و زیادکردن و گۆڕانکارییە بچوك و بەمەبەستانە نەبێ کە بەسەر چیرۆکە مێژووییەکەدا هێنابوو مەبەستی ئەو بابەتە باسکردنی بونیادی درامی ئەو شانۆنامەیە.

بە شێوەیەکی گشتی شانۆنامە کاردەکا بۆ گەیشتن بە (کلایماکس)[2] لە نزیك کۆتایی رووداوەکان بەڵام لە شانۆنامەی (یۆلیۆس قەیسەر) کلایماکس کە دەکاتە کوشتنی قەیسەر دەکەوێتە ناوەڕاستی شانۆنامەکە لە بەشی دووەمی شانۆنامەکە قەیسەری دیکتاتۆر دەکوژرێت. ئاخۆ دەبێ چ شتی ببێتە ناوەندی بایەخ پاش نەمانی کەس سەرەکی؟! یەکسەر پاش ئەو رووداوە رووبەربوونەوەی مارك ئەنتۆنی یەکێ لە پێکهێنەرانی حکومەتە سێ قۆڵییەکە لەگەڵ پیلانگێران بەدی دەکرێ، مارك ئەنتۆنی هەوڵی تۆڵەسەندنەوەی قەیسەر دەدات، بایەخ بە هێزتر دەبێ لەو دژەکردارەی کە مارك ئەنتۆنی خەریکی ئامادەکردنیەتی. بایەخی قەیسەر سەرەڕای کوژرانی بەهۆی قسەکانی مارك ئەنتۆنی هەر لە شانۆنامەکە دەمێنێتەوەو دەپارێزرێت، دواتر کاتێ ئەو بایەخە رووەو بێ هێزی و لاواز بوونی هەنگاو دەنێ، شەکسپیر دووبارە بەرگی ژیانی بەبەرادەکاتەوە بە هۆی ئەو شەڕە کورت خایەنەی نێوان بروتەس و کاسیۆس ئەمەش هەندێ بایەخ دەگێڕێتەوە بۆ دوو پیلانگێڕە سەرەکییەکە ناوەندی بایەخ

بەردەوام دەگوازرێتەوە بە شێوەیەك ئاراستەی بەزەییمان جارێ بۆ لایەك و جارێکی تر بۆ لایەکەی دی دەبێ لە بەشی پێنچەم و کۆتایی شانۆنامەکە دەبینین چارەنووس بە دەستێکی بێ بەزەییانەو حەتمی لە قەدی بروتەس و کاسیۆس ئالاوە، لەو کاتەدا شانۆنامەکە تەشویقی تێدا نامێنێ چونکە کۆتایی بە ئاشکرایی و دلنیاییەوە دەبینرێت.

یەکگرتوویی شانۆنامەکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو راستییەی کە هەموو رووداوەکانی دووبەشی یەکەم بە مردنی قەیسەر کۆتایی دێ و سێ بەشەکەی دواییش مامەڵە لەگەڵ ئەنجامەکانی ئەو مردنە دەکات رۆحی قەیسەر لە ناو شانۆنامەکە دەمێنێتەوە بۆ ئەوەی بکوژەکان ڕاو بنێت تارمایی قەیسەر بەدوای تۆڵەدا دەگەڕێ و دەبێتە لایەنگیرێك بۆ مارك ئەنتۆنی و ئۆکتاڤیەس، بۆ پیشاندانی وجودی بەردەوامی قەیسەر شەکسپیر تارمایی قەیسەری بەکارهێناوە کە لە لای بروتەس دەردەکەوێ، بەم شێوەیە شەکسپیر سەرکەوتوانە توانی ئەو ئینتباعە بپارێزێ کە قەیسەر هێشتا هەر لە ناو شانۆنامەکە ماوە، تارمایی قەیسەر وای لەبروتەس کرد کە بڵێ:

**" ئۆه! یۆلیۆس قەیسەر**

**تۆ هێشتا هەر بەهێزی رۆحەکەت**

**سەفەر دەکا و شمشێرەکانمان**

**بۆ ناو هەناوی خۆمان دەگێرێتەوە"**

هەورەها بروتس لە کاتی سەرەمەرگی خۆی قسە لەگەڵ رۆحی قەیسەری کوژراو دەکاو لەو باوەڕەیە کە ئەو لێپرسراوە لە هەموو کارەساتە یەك لە دوای یەکەکان و دەڵێ:

**" قەیسەر ئێستا بۆ خۆت بمێنەوە**

**من زۆر بە چاکی تۆم نەکوشت".**

بالاّ دەستی کەسایەتی قەیسەر بەم شێوەیە لەسەر هەموو شانۆنامەکە، لەگەڵ ئەو راستییەی کە شانۆنامەکە ناوی ئەو هەڵدەگرێ وای لە هەندێ کەس کردووە کە پێیان وابێ شەکسپیر ویستویەتی قەیسەر بکا بە پاڵەوانی شانۆنامەکە، بەڵام هەندێکی تر لەو باوڕەدان کە بروتەس تەواوترین کارەکتەرو زۆر بە دیقەتەوە مامەڵەی لەگەڵ کراوەو پێیان وایە شەکسپیر وردەکارییەکی زۆری لە دروست کردنی ئەو کارەکتەرە بەکارهێناوە بۆیە بروتەس بە پاڵەوان یان بەلایەنی کەم بە



کەسی سەرەکی شانۆنامەکە دادەنێن.. دیاریکردنی کارەکتەرێك لە شانۆنامەیەك و بڕیاردان لەسەر کەسایەتی و چارەنووسی بۆ پێك هێنانی بیرۆکەیەك یاخود بایەخی ئەو کارەکتەرە لە سەرەتاوە تا کۆتایی شتێکی مەحاڵە، لە بارەی قەیسەرەوە ئەمە ناتوانرێ ئەنجام بدرێ بە جۆرێ لە دوو بەشی یەکەمی شانۆنامەکە ئێمە زیاتر بایەخ بە پیلانگێڕە سەرەکیەکان، بروتەس و کاسیۆس، دەدەین وەك لە قەیسەر سەراپای بەشی یەکەمی شانۆنامەکە کاسیۆس تێیدا بالاّ- رۆڵە و ئەو بە تەنها رووداوەکان و بەرەو پێش چوونیان بەڕێوەدەبات ماوەیەکی کەم پێش کوژرانی قەیسەر، برۆتەس دەبێتە کارەکتەرێکی بالاّ-رۆڵ، دەبێ ئەوەش لەیاد نەکەین کە پاش کوژرانی قەیسەر، مارك ئەنتۆنی شوێنێکی سەرەکی لە شانۆنامەکە بە خۆی دەگرێت لە دوایین دیمەنەکانی شانۆنامەکە ئاراستەی بەزەیی بەرەو ئەو کارەکتەرە کەساس و غەمبارانە دەبێ بروتەس و کاسیۆس کە ئەو کارەساتەیان بەسەردا هات. لە هیچ شانۆنامەیەکی تر ئەو گواستنەوەی بایەخە لە کارەکتەرێك بۆ یەکێکی تر بەدی ناکرێ، لەمەشدا (یۆلیۆس قەیسەر) جیاوازە لەگەڵ ئەو تراژیدیایانەی کە تێیاندا پاڵەوان هەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی ناوەندی بایەخە ڕاستە بروتەس گەشەسەندووترین کارەکتەرەو هەندێ لەگەڵ هاملێتی رۆشنبیر بەراووردی دەکەن، بەڵام دەبێ ئەوە بزانین کە مەزنێتی قەیسەر لە دووبەشی یەکەمدا بروتەسی داپۆشیبوو و دواتریش بە هەمان شێوە مارك ئەنتۆنی دایدەپۆشی کەواتە دەتوانین بلێین کە لەم شانۆنامەیەدا هیچ کارەکتەرێك بە تەنها ناوەندی بایەخ نیە.

کارەکتەری قەیسەر — پێك هێنەرێکی ئیمپراتۆریەت- ئەو مەزنێتیە راستەقینە پیشان نادا کە ئێمەی خوێنەرو بینەر چاوەڕوانمان دەکرد. دەبێ بگەینە ئەو ئەنجامەی کە شەکسپیر بەمەبەستەوە وازی لە نوسینی شانۆنامەی تاك پاڵەوان هێناوە بە شێوەیەکی سەرەکی ئەمەش هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە راستییەکە گەر شەکسپیر وای بکردایە ئەوا لەگەڵ مەرامی درامیی شەکسپیر نەدەگونجا کە مەبەستەکەی پێشاندانی سەردەمێکی مێژوو بوو نەك تەنها کەسێك گەر قەیسەر تاکە پاڵەوانی شانۆنامەکە بوایە ئەوا پیلانگێڕەکان بە تەواوی دادەپۆشران و هەڵگەرانەوەو دژە کردارەکانیان بێ پاساو دەمایەوە. زۆر پێویست بوو پیلانگێڕان واپیشان بدرێن کە بەهۆی چەند هەستێکی شیاو و شایستە هانبدرێن هەروەها پێویست بوو بایەخ و بەزەیی خوێنەر و بینەر لە حاڵەتی بزافتن بهێلرێتەوە بێ ئەوەی بتوانن بڕیار بدەن ئاخۆ ئاراستەی بەزەییان بەرەو قەیسەر بێ یاخود پیلانگێڕان. بەم جۆە دەبوو بروتەس و کاسیۆس بەڕادەیەك گرنگ بن کە توانای بەرگەگرتنی ئەرکی ناوەندە-

بایەخیان هەبێ کاتێ نۆرەیان دێت گەر شەکسپیر قەیسەری بکردایە تاکە پاڵەوانی شانۆنامەکە ئەوا توشی کێشەی پاراستنی بەردەوامی و یەکگرتوویی درامیی دەبوو پاش ئەوەی قەیسەر لە بەشە سەرەتاییەکانی شانۆنامەکە دەکوژرێت گەر تۆزێك لە دیمەنە سەرەتاییەکان وردبینەوە ئەوا نەخشەی شەکسپیر بە ئاشکرایی بەرچاو دەکەوێ من پێم وایە شەکسپیر بە ئەنقەست جەختی لەسەر خاڵە بێ هێزەکانی کارەکتەری قەیسەر کردۆتەوە بە مەبەستی کەمکردنەوەی نرخی ئەو تایبەتمەندێتییانەی کە وایان کردووە قەیسەر و ناوبانگەکەی بکەونە مێژووەوە.

بە مەبەستی کورتکردنەوەی نمایش شەکسپیر رووداوە مێژوویییەکانی لە یەکتر نزیك کردۆتەوە، ئەو رووداوانەی کە لە مێژوودا ماوەیەکی زۆر لێکیان جیادەکاتەوە لە دیمەنی یەکەمی شانۆنامەکە کۆمەڵە خەڵکێك دەبینین خەریکی خۆ سازدانن بۆ ئاهەنگ گێڕان بەبۆنەی ئەو سەرکەوتنە نوێیەی قەیسەر، هەروەها کارەکتەرەکان بە بینەر دەڵێن کەوا ئەوە جەژنی (لوپێرایکەل)ە بەڵام لە راستیدا ئەو سەرکەوتنەی قەیسەر لە مانگی ئۆکتۆبەری ساڵی ٤٥ پێش زایین تۆمار کراوە، ئەو جەژنەش لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی رۆمدا لە مانگی دوو ساڵی دواتر بووە دواتر لە مێژوو ئەوەمان دەخاتە بەرچاو کە ئەو جەژنە و کوژرانی قەیسەر بەلایەنی کەم مانگێك دەکەوێتە نێوانیان بەڵام شەکسپیر لە شانۆنامەکە کوژرانی قەیسەر دەخاتە رۆژی دوای جەژنەکە لە شانۆنامەکەدا وتاری پرسە لەسەر تەرمی قەیسەر لەلایەن ئەنتۆنی هەمان رۆژی کوشتنەکە دەخوێندرێتەوە کەچی لە راستیدا پێنج رۆژ کوشتن و وتاری پرسە لێك جیا دەکاتەوە یەکسەر دوای پرسە ئەنتۆنی پێی رادەگەیەنرێ کە ئۆکتاڤیەس تازەهاتۆتە رۆم، بەڵام لە راستیدا هاتنی ئۆکتاڤیەس بۆ رۆم پاش دوو مانگ لە پرسەی قەیسەر روویداوە. پاش تێپەربوونی ساڵێك و نیو ئینجا حوکمەتی سێ قۆڵییەکە دادەمەزرێ کە دیمەنی یەکەمی بەشی چوارەم شانۆنامەکە وەسف کراوە. زۆر لەو رووداوانەی لەو ماوەیەدا روویانداوە لەلایەن شەکسپیرەوە باس نەکراون چونکە گرنگی درامیان نەبووە بۆ نموونە کورتە شەڕێك لە نێوان ئەنتۆنی و ئۆکتاڤیەس هەبوو پێش ئەوەی ئاشتببنەوە، بەڵام شەکسپیر باسی ئەوەی نەکردوە چونکە پێی وابوو باسکردنی ئەو کورتە شەڕە خزمەتی نەخشە درامییەکەی ناکات. شەکسپیر ئەو رووداوانەی فەرامۆش دەکرد کە نەدەشیان بۆ دراما، لە (فلیپی) دوو شەڕ رویداو و ماوەی سێ هەفتە لێکی جیادەکردنەوە، بەڵام شەکسپیر وا وەسفی کردوون کە لە هەمان رۆژدا ڕوویاندا بێ . ئەم کورتکردنەوەیە پێویستییەکی



حەتمی بوو بۆ گرنگێتی یەکگرتوویی درامی. درامای رۆمانەکان مەبەستی تۆمارکردنی وردی مێژوو نەبوو، دەبێ ئەوەش بزانین کە ( یۆلیۆس قەیسەر) پێویستە وەك دراما حوکمی لەسەر بدرێ نەك وەك مێژوو لەسەر شانۆ کارەکتەرەکان و  رووداوەکانی چوار رۆژمان بۆ پیشان دەدەن:-

**رۆژی یەکەم:** سەرکەوتنی قەیسەر لەشەڕدا. جەژنی لۆپێرایکەل. هەڵکردنی ڕەشەبا.

**رۆژی دووەم:** پیلانگێران لە ماڵی بروتەس کۆدەبنەوە دواتر لە ماڵی قەیسەر یەکتر دەبیننەوە، دەچنە کۆشك و لەوێ قەیسەر دەکوژرێ. ووتارەکە ئەنتۆنی و بروتەس دواتریش رێپێوانی نارەزایی خەڵك. چاوپێکەوتنی سێ سەرکەوتووەکە واپیشان دراوە وەك بلێی هیچ ماوەیك لە رووداوەکانی جیانەکردۆتەوە.

**رۆژی سێیەم:** بروتەس و کاسیۆس لە شاری (ساردیس)ن هیچ رونکردنەویەك نەدراوە لەسەر ئەو رووداوانەی کە پاش بەجێهێشتنی رۆم روویداوە شەڕو ئاشتبونەوە، بڕیاردان بۆ چونەپێش هەموو ئەمانە لەو رۆژەدا روویدا.

**رۆژی چوارەم:** شەڕی فیلیپی دەستی پێکردو هەرهەمان رۆژ کۆتایی هات و دۆرانی کۆتایی پیلانگێڕەکان و مردنی بروتەس و کاسیۆس هەموو ئەمانە لە دوا نیوەڕۆی ئەو رۆژ ڕوو دەدەن.

شەکسپیر لەم شانۆنامەیەدا جیا لەوانی تر، ماوەی پچرانی کورت پیشان نادات بەڵکو چەند شتێکی دیاریکراو بەیەکەوە دەبەستێتەوە بۆ ئەوەی بەردەوامی بە رووداوەکان ببەخشێ لە بەشی یەکەمی شانۆنامەکەدا شەکسپیر هەنگاو دەنێ بەرەو پیشاندانی ئەوەی کە چەندین رووداوی جۆراو جۆر لە هەمان رۆژدا روودەدەن لەبەشی دووەمدا چیرۆکی (پورشیا) و (ئارتیمیدرۆس) باسکراوە، بەڵام ئەمە تەنها پچرانێکی کورتە و بەمەبەستەوە ئەنجامدراوە، باسکردنی ئەم چیرۆکە رێگە بۆ قەیسەر خۆش دەکا بۆ ئەوەی بەخێر هاتنی مێوانەکان بکا و لەگەڵیان بچێتە (کابتۆڵ)[٣]. لە کۆتایی ئەو رۆژەدا ئەنتۆنی تەرمی قەیسەر هەڵدەگرێ و دەیبات بۆ کابتۆڵ و دواتر قسەکانی ئەنتۆنی و بروتەس دوابەدوای ئەمە دێن، دەبوو بەلایەنی کەم پچڕانی کات چەند رۆژێك بوایە. پاشان هەرچەندە نمایشی بەردەوامە، ئینتابعێك لەلای بینەر دروستکراوەکە کاتێکی زۆر تێپەریووە بەسەر کوشتنی قەیسەر لەو کاتەدا هەموو کۆمەڵەو پارتەکان لەشەڕی فیلیپی رووبەرووی  یەکتر دەبنەوە لە مێژوودا، بەلایەنی کەم ساڵێك دەکەوێتە نێوان رووداوەکانی دیمەنی یەکەم و دووەمی بەشی چوارەم، بەڵام ئەم

راستییە بە هیچ شێوەیەك باسی لێوەنەکراوە هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە ئەو بۆ راستییە کە گەر بینەر هەستی بکردایە کە ڕووداوەکانی سالێکی تەواو لێی شاردراوەتەوە ئەوا لەوانە بوو ببێتە هۆی تێکشکاندنی بەردەوامی درامیی.

هەرچەندە شەکسپیر لە رووی کارەکتەرو رووداو زۆر لە پلوتارخی مێژوونووس نزیکە، بەلام مافی بە خۆیداوە دیدو بۆچونەکانی خۆی سەبارەت بەکارەکتەرکان بخاتە ناو شانۆنامەکە. بەشێوەیەکی بنەڕەتی شەکسپیر باسی پالنەرەکانی کارەکتەرەکان دەکات. شەکسپیر مێژوو بەهادارتر دەکات بە مەبەستی کاریگەری درامیی. ئەو کارەکتەرانەی کە شەکسپیر لە (پلوتارخ) وەریگرتووە لەگەلْ ئەو کردارانەی کە کارەکتەرەکان پێی هەلْساون هیچ نەگۆڕان.. تەنها ئەوە نەبێ لە حالەتی پێویستی و بە مەبەستی خزمەتکردنی کاریگەری درامیی، هەندێ کارەکتەرە سیفاتی چاکتریان دراوەتە پالْ و هەندێکیش خراپتر نیشان دراون. هەندێ لە درێژدادڕییەکانی پلوتارخ کورتکراونەتەوە. یاخود بە چەند خاسیەتێکی تر جێیان گیراوەتەوە بۆ نمونە کاسیۆسی شەکسپیر زۆر پیاوانەترو دلْسۆزترە لە کاسیۆسی پلوتارخ، چونکە پلوتارخ وەك پیاوێکی حەسود ناوی دەبات و رکابەری نێوان بروتەس و کاسیۆس دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەو هۆیە بەلام شەکسپیر بەهیچ شێوەیەك باسی ئەمە ناکا و کاسیۆس وەك نیشتمان پەروەر وەسف دەکاو لەگەلْ بروتەس دەیانکاتە یاخیبوو. زیاتریش کاسیۆسی شەکسپیر پیاوێکی جدی و ماقپەروەرە، بە هەمان شێوە پلوتارخ چەند ڕاستیەك دەربارەی بروتەس باس دەکات وەك خراپی مامەلەکردنی لەگەلْ قەرزارەکانی و وەرگرتنی قازانج و سودێکی زۆرلێیان. هەروەها بروتەس ژنی یەکەمی تەلاقداوە بۆ خواستنی پۆرشیا زیاتریش پلوتارخ نوسیویەتی بروتەس پیاوێکی زۆرخۆر بووە، بەلام شەکسپیری درامانووس ئەمانەی هەموو لابردووە چونکە باسکردنیان خزمەتی ناکا بۆ دروست کردنی ئەو کارەکتەرەی ئەو دەیویست لە ڕوانگەیەکی درامییەوە.

چونکە وەك پێشتر وتراوە مەبەستی شەکسپیر تۆمار کردنی بەسەرهاتەکانی ژیانی بروتەس نەبووە لە تەك ئەمانەدا پلوتارخ باسی چەند سیفاتێکی چاکی بروتەس دەکاو شەکسپیر بەهادارترو بەهێزتریان دەکات.



شەکسپیر بەسەرهاتێك دادەهێنێ و دەیخاتە ناو شانۆنامەکە کە ئەویش خەولێکەوتنی (لوسیەس) لەسەر ئالەتە مۆسیقییەکەی ئەمەش بە مەبەستی جەختکردن لەسەر لایەنی چاك و بەرزیی بروستە. پلوتارخ باسی ئەوەش دەکا کە پیلانگێڕان پاش کوشتنی قەیسەر لە شوێنێك خۆیان دەشارنەوە تا ئەو کاتەی باردۆخ هێور دەبێتەوە.

ئەگەر بروتەس خۆی بشاردبایەوە بترسابایە ئەوا وەك پالەوان دەرنەدەکەوت بۆیە شەکسپیر وایپیشان دەدا کە پیلانگێڕان دوای کوشتنی قەیسەر بوێرانە خۆیان و شمشێرە خوێناوییەکەیان بەشەقامەکان دەسوڕێنەوەو بێ باکن لە دەرئەنجامەکانی ئەم کردارەیان. شەکسپیر کارەکتەرە حەقیقی و رووداوە سەرەکییەکانی مێژووی پاراستووە بەلام لێرەو لەوێ چەند گۆڕانکارییەکی بچوکی تێدا کردووە بە تایبەتی جەختی لەسەر ئەو کارەکتەرو رووداوانە کردووە کە مەرامی درامی دەپێکن. پلوتارخی مێژوو نووس نووسیویەتی کە پاش ئەوەی ئەنتۆنی لە پرسە وتارەکەیدا خەلکی وروژاند کە پیلانگێڕان هەلاتن، لەبەر ئەوەی لەو کاتەدا شەکسپیری درامانووس چیتر پێویست نەبووە پیاوەتی و ئازایەتی بروتەس دەربخا بۆیە ئەوەی لانەبردووەو بەمەش سەرکەوتوو بوو لە گواستنەوەی ئاراستەی بەزەیی بۆ قەیسەر و مارك ئەنتۆنی.

بەهەمان شێوە شەکسپیر چەمکی عەدالەت بەهادارتر دەکا لەم شانۆنامەیەدا. شەکسپیر هەولی ڕاڤەکردنی نەخشەی عەدالەتی شیعری نەداوە کە هەموو چاکێك لە کۆتاییدا پاداشت وەردەگرێ و خراپیش سزا دەدرێ. لە تراژیدیاکاندا تاوان و هەلەی پالەوان دەبێتە هۆی کارەسات و کارەکتەری بێ تاوانیش لەگەلْ خۆی دەسوتێنێ. بەلام شەکسپیر چەمکی عەدالەت بەڕادەیەك بەهادار دەکا کە سزای خراپەکان پڕ بە پێستی خۆیەتی و زێتریش وەك لە ژیانی ئاسایی. لەم شانۆنامەیەدا دەبینین کاسیۆس بەهەمان شمشێری خۆی دەکوژرێ کە قەیسەری پێ کوشت. عەدالەت ڕۆحێکی تۆلەسێنەو ڕاوی تاوانبار دەنێ. پێم وایە ئەو جۆرە ڕاڤەکردنە زۆر گونجاوە بۆ کاریگەری درامیی، بۆ جەخت کردن لەسەر ئەمەش شەکسپیر پیلانگێڕان زۆر توند و دلڕەق پیشان دەدا چونکە دوای کوشتنی قەیسەر پیلانگێڕان دەستەکانیان تا مەچەك لە خوێن هەلدەسون. ئەمە لە مێژووی پلوتارخ بەدی ناکرێ. ئەمانە هەموویان وا لە چەمکی عەدالەت دەکەن زۆر بەهادار و سەرنج راکێش بێ.

شەکسپیر هەندێ رووداوی مێژوویی بەهادارترو روونتر دەکاتەوە کە پلوتارخ بە سەر زارەکی باسیان دەکات. ئەمەش لە چۆنیەتی نیشاندانی جلەکانی قەیسەری کوژراو بەدی دەکرێ لەلای مارك ئەنتۆنییەوە. ئەنتۆنی بایەخێکی تایبەتی لە لای ئامادەبووانی پرسە دروست دەکا و وتی قەیسەر بۆ یەکەم جار پاش شەری سەرکەوتووی ( نێرڤی) ئەو جلانەی لەبەرکرد. ئەمە داهێنانی شەکسپیرە. پێویست بوو شەکسپیر راستییەکان بڕازێنێتەوەو فراونتریان بکات ئەمەش زۆر بە پوختی لەپرسە- وتاری ئەنتۆنی نیشان دراوە. پلوتارخی مێژوونووس نوسیویەتی ( کاتێ ئەنتۆنی بینی خەڵکی زۆر دڵخۆش بوون و حەزیان نەدەکرد چیتر گوێ بیستی ستایشی قەیسەر بن، هەڵسا ئەو وتارەی تێکەڵ کرد لەگەڵ چەند قسەیەکی توانج — ئامێز بەمەش توانی سەرکەوتوانە دڵی خەڵك بهەژێنێ و هەستی بەزەییان لا دروست بکات). لەو چەند وشەیەدا شەکسپیر توانی ژیرانە پرسە وتارێکی مەزن و درامی کاریگەری پێك بهێنێ، وتارێك پڕ لە دیمەنە-وشەی کاریگەر.

شەڕەکەی نێوان بروتەس و کاسیۆس بەهادارتر کراوە. پلوتارخ لیستەیەك لە هۆیەکانی ئەم شەڕەی نوسیوەو بە تێروتەسەلی باسی شەڕەکە ناکا و ناوی ئاشتبوونەوەش ناهێنی. خوێنەر دەبێ خۆی بگاتە ئەو ئەنجامە کاتێ کاسیۆس و بروتەس دەبینێ کە پەیوەندی هاوڕێیانە بەیەکیان دەبەستێتەوە. بەڵام شەکسپیر ئاشتبوونەوەکە لە دیدگەیەکی درامییەوە زۆر کاریگەرترو سەرنج راکێشتر دەکا وەك لە شەڕەکە، ئەمەش ئەو بۆچونەی ژیانی ئاسایی دەسەلمێنی کە پەیوەندی نێوان هاوڕێ نزیکەکان دەتوانرێ پتەوتر بکرێ بەهۆی لێکدابڕانێکی کاتی. لێرەدا دەبینین شەکسپیر چەند ژیرانە ڕوداوە مێژووییەکانی ڕێك خستووە بە مەبەستی بوونی کاریگەریەکی پتەوترو زیاتر لەسەر بینەر یان خوێنەر. پلوتارخ نوسیوویەتی شەڕەکە دوو رۆژی خایاندووە. لە رۆژی یەکەم دا هۆی شەڕەکە دیار نەکراوە. لە رۆژی دووەم دا هۆیەکەی روون دەبێتەوە کە ڕیسواکردنی (لۆشیس پیلا)یە لەلایەن بروتەسی بەڵام شەڕەکە لە شانۆنامەکەی شەکسپیر کورت خایەن و خێرایە، هەر لەسەرەتاوە کاسیۆس ناڕەزایی و گلەیی خۆی بەرامبەر سزادانی (پیلا) دەخاتەڕوو. بە ڕای من ئەم شێوەیە زۆر کاریگەرترە بۆ پێکانی مەرامی درامیی وەك لە شێوە درێژدادڕەکەی پلوتارخ، تازە هاوڕێیەکان ئاشت بوونەوە کاتێ هەواڵی مردنی (پۆرشی) یان پێ ڕاگەیەنرا. کاریگەری درامیی و سۆزداریی ئەو



هەواڵە دڵتەزێن و غەمناکە لەو کاتەدا زۆر بەهێز بوو، ئەمەش یەکێك بۆ داهێنانەکانی شەکسپیر چونکە پلوتارخ باسی مردنی پۆرشیا لە کاتێکی تەواو جیاوازدا دەکات.

هەر لە سەرەتای دەست پێکردنی ڕەخنەی شەکسپیریی تا رۆژی چاپەنوێیەکەی (یۆلیۆس قەیسەر)ی پرۆڤیسۆر جۆن دۆڤەر ویلسن دوو ڕەخنەی سەرەکی هەیە کە ئەو لێکۆڵەرەوانەی مامەڵەیان لەگەڵ ئەم شانۆنامەیەدا کردووە، لەسەری کۆکن. یەکەم ڕەخنە ئاراستەی ئەو بەشە کراوە کە شەڕەکەی نێوان بروتەس و کاسیۆس لەخۆ دەگرێ، دیمەنی شەڕەکە لەلایەن (ا.س.بردالی) رەخنەگر بەم شێوەیە وەسف کراوە کە بەسەرهاتێکی زیادە و هیچ ناخاتە سەر شانۆنامەکە و دەڵێ: " لابردن دیمەنی شەڕەکە هیچ کارناکاتە سەر ریزبەندی و بەردەوامی رووداوەکان" . بەڵام من پێم وایە وەڵامدانەوەی ئەو رەخنەیە زۆر ئاسانە دەتوانم بڵێم دیمەنی شەڕەکە چەندین خاڵ و سیفەتی کەسایەتی بروتەس و کاسیۆسی ئاشکرا کرد کە نە دەتوانرا بە شێوەی تر ئاشکرا بکرێن و سەرەڕای ئەو راستییەی کە ڕۆڵ و کۆتایی بروتەس هەندێك هاوبەشی لەگەڵ پاڵەوانی تراژیدی تێدا بووە بەڵام بیرۆکەی سەرەکی شانۆنامەکە تراژیدیای رۆحی ئادەمیزاد نەبوو، چارەنوسی بروتەس و هاورێیەکانی نەبوو بەڵکو وەك چۆن پرۆڤیسۆر ویلسن نوسیویەتی بیرۆکەی سەرەکی شانۆنامەکە "چارەنوسی ئیمپراتۆریەتی رۆمانی بوو، بابەتی ململانێیەی کە تا ئێستاش لە هەموو جیهان هەر دەبینرێ و کۆتایی نەهاتووە" کەواتە تراژیدیای شانۆنامەکە لەوەدا نیە بروتەس مردوو و لەبەر چاو وون بوو بەڵکو لەوەدایە کە هۆکاری ئازادی پەکی خرا. بەمەش دەست هێنانی ئازادی دواخرا.

گەر لە دیمەنی شەڕەکە وردبینەوە، واتایەکی قوڵتر دەبەخشێ وەك لە تەنها لێك دابڕانێکی کاتی نێوان دوو هاوڕێ. هۆی سەرەکی شەڕەکە دەگەڕێتەوە بۆ کارەکتەرێك بە ناوی (پێلا) کە ئەفسەرە و بەرتیلی وەرگرتووە و پایەکەی بۆ بەرژەوەندی خۆی بەکارهێناوە. بروتەس وەك تاوانێکی گەورە سەیری ئەم کارەی دەکرد و پێی وابوو قەیسەری ئیمپراتۆر تەنها لەسەر ئەو کردەوە گەندەڵیانە کوژرا، پێی وابوو ئەوان هاتوون وڵات لە گەندەڵی پاك بکەنەوە ئێستاش دەبینێ یەکێك لە هاوەڵەکانی خۆی ئەم کارە دووبارە دەکاتەوە بۆیە بە تاوانبار ئیدانەی کرد. بەڵام کاسیۆس پێی وا بوو ئەو کێشە نابێ ئەوەندە بە قووڵی و بە جدی وەربگیرێ. بروتەس ئەم بۆچوونەی پێ پەسند ناکرێ چونکە پێی وابوو (پێلا) باج لەو هەژارانە وەردەگرێ کە بروتەس و

کاسیۆس و هەلگەڕاوەکان مەبەستیان رزگارکردنیان بوو نەك زیاتر چەوەساندنەوەیان سەرەڕای ئەوەی شەڕەکە بە ئاشتبوونەوە کۆتایی هات بەڵام شتێك لە مێشکی بروتەس گۆڕاو نەدەتوانرا وەك پێشووی لێببێتەوە چونکە پروتەس دڵنیا بوو لەوەی کە ئێستا ئەو خۆیەتی و بەس! بێ ئەوەی کەس پشتگیری بکات. لێرەدا کاسیۆس هیچ جیاوازییەکی نیە لەگەڵ ئەو هاووڵاتییەی کە دوای گوێگرتن لە وتارەکەی بروتەس سەبارەت خراپەکاری و گەندەڵیەکانی قەیسەر هاواریان کرد با بروتەس بکرێ بە پادشا. کاسیۆس و هاوڵاتییەکان نەیاتوانی لە هۆیەکانی هەلگەڕانەوە بگەن وەك بروتەس باسی دەکرد. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە پاڵنەر ون بووە چونکە پێدەچوو بروتەس زووتر لە کاتی گونجاوی خۆی هاتبێتە دونیا. بۆ کۆمەڵگەیەك کە ئەندامەکانی وەك کاسیۆس بیربکەنەوە پەیدابوونی حوکمڕانی دیکتاتۆر شتێکی حەتمی بوو. کاتێ بروتەس گەیشتە گۆرەپانی فلیپی تازەکار لەکار ترازا بوو ، دۆڕا بوون. گەر لەم گۆشە نیگایەوە سەیری دیمەنی شەڕەکە بکەین ئەوا چیرۆکێکی ئەو دیمەنە زۆر بەهادارە و شتێکی پێویستە بۆ بونیادی درامیی شانۆنامەکە.

باسکردنی رەخنەی دووەم تێگەیشتنی رەخنەی یەکەم ئاسانتر دەکات. رەخنەی دووەم ئاراستەی یەکگرتوویی درامیی شانۆنامەکە کراوە. رەخنەگران پێیان وایە شانۆنامەکە کەموکوڕی لەم لایەنە هەیە چونکە رووداوێك دەبێتە هۆی کوشتنی یەکێك لە کاپیتۆل، دواتر رووداوی دووەم لە فیلیپی کۆتایی دێت. بەمەش دوو بیرۆکە بەرچاو دەکەوێ کە تێیدا بە یەکسانی بایەخ بە قەیسەر و بروتەس دراوە.

ئەم رەخنەیە هەر هۆیەکی هەبێ ئەوە بەندە لەسەر ئەوەی کە پێویست بوو شانۆنامەکە لەسەر هەمان هێلی چوار تراژیدیا مەزنەکە بڕوا کە تێیاندا پاڵەوانی ئالۆز بەدی دەکرێن. بەڵام گەر ئەو بۆچوونانەی پرۆڤیسۆر ویلسن ڕاست بێ ئەوا بیرۆکەی سەرەکی شانۆنامەکە زۆر جیاواز دەبێ. پێم وایە ئەو ئینتباعەی شەکسپیر دەیویست بیگوازێتەوە بینەر و خوێنەر بە چاکی تێی نەگەیشتوون. پرۆڤسیۆر ویلسن نوسیوویەتی " گەر ئەم شانۆنامەیە ئەمڕۆ بنوسرایە پێویست بوو ناونیشانەکەی (قەیسەر و قەیسەریزم) بێ بەڵام ئەو زاراوە ئەبستراکتانە ئەو کاتە لە ئارادا نەبوون.. چونکە شانۆنامەکە یەك بیرۆکەی سەرەکی هەیە ئەویش ئازادی دژ بە دیکتاتۆریەت".

بەم شێوەیە بۆمان دەردەکەوێ کە قەیسەر تەنها حوکمڕانێکی بەهێز نەبوو بەڵکو زۆر لەوە زیاتر بوو. قەیسەر یەکەم کەس بوو بیرۆکەی حوکمڕانی کردنی هەموو جیهانی هێنایە بوون،



یەکەم کەس بوو کە بیری لەپێشێلکردنی مافی تاکە کەس کردەوە. قەیسەر پێشەنگی ناپلیۆن و ولیەم قەیسەر و هیتلەرو ستالین بوو. ئەو وشانەی بروتەس " ئێمە هەمووومان دژی رۆحی قەیسەر رادەوەستین" ئەو بوارە فراوانەی ململانێ پیشان دەدا کە خۆی دەستی پێکرد. بروتەس لەو ململانێیەدا دۆڕاندی چونکە رۆحی قەیسەر یاخود قەیسەریزم بەسەریدا زاڵ بوو کە تا ئێستاش هێزێکی راستەقینە و سەرچاوەی هەڕەشەیە لە ئازادیمان، لە ماڵمان و لە رۆحمان.

زۆربەی نووسەرانی سەدەکانی ناوەڕاست قەیسەر وەك حوکمرانێکی زاڵم ناودەبەن و پێیان وایە جیاوازە لەو پادشا و ئیمتراتۆرانەی پێش خۆی کە ئیدیعای خوایەتییان دەکرد و دەیانویست لەلایەن خەڵکییەوە بپەرسترێن. شەکسپر زۆر بە چاکی شارەزای ئەم راستییە بوو. هەتا دوای سەردەمی شەکسپیریش هەندێ خەڵك پێیان وابوو پادشاکان نوێنەری خودان لەسەر زەوی. ئەوەتا نووسەرێك نووسیویەتی " قەیسەر بەڕادەیەك لە خۆبایی ببوو دەیووت دەبێ بڕیارەکانی وەك یاسا کاری پێبکرێ، دەیویست خەڵکی بیپەرستن، تەنها ئەو بۆچوونەش بوو بووە هۆی لە ناو چوونی و بووە هۆی ئەو ڕق و کینەیەی خەڵکی بەرامبەر یادەوەریەکانی، چونکە قەیسەر دەیویست لە ڕێگەی تێك شکاندن و لەناوبردنی وڵات میللەتەکەی بگات بە مەرامە گڵاوەکانی خۆی".

من پێم وایە شەکسپیر ئەو لێکدانەوەیەی لا پەسەند بووە بۆیە دەبینین هیچ بیرۆکەیەك لە مێشکیدا نەبووە کە قەیسەر بکا بە تاکە پاڵەوانی شانۆنامەکە. لە ڕاستیدا شەکسپیر لەم شانۆنامەیەدا هەموو ئەو خاڵانەی باسکردووە کە لە کەسایەتی قەیسەر کەم دەکەنەوە زیاتریش لە خۆبایی بوون و لووت بەرزی و چاوچنۆکی بۆ هێز سیفاتی هەموو دیکتاتۆرەکان پیشان دەدات.

بروتەس دان بەوەدادەنێ کە لە هەڵسوکەوتی قەیسەر زۆر خراپ نەبوو، بەڵام نەیدەزانی دەرئەنجامی زیادبوونی ئەو هێزو دەسەڵاتە چی دەبێ، بروتەس وا بیری دەکردەوە کە قەیسەر کاتێ دەگاتە لوتکە بە چاوی سووکەوە سەیری خەڵکی دەکات و پڕ بە مانای وشە دەبێتە دیکتاتۆر. بۆیە دەبینین شەکسپیر بەزەیی بەرامبەر ئەو بیرکردنەوەی بروتەس پیشان دەدات کوشتنی قەیسەر نەبووە هۆی چارەسەر کردنی کێشەکان.

برۆتەس نەیتوانی بگاتە ئەو قەناعەتەی کە دیکتاتۆریەت بەم شێوەیە بێ یان شێوەیەکی تر بوونی حەتمییە لە پێکهاتەی ئیمپراتۆریەتی رۆمانی.

ئەگەر بەو راڤە كردن و تێڕوانیانە ڕازی بین ئەوا چەندین بیروبۆچوونی دێرین سەبارەت بە سروشتی شانۆنامەی (یۆلیۆس قەیسەر) دەسڕێتەوە. شانۆنامەکە لێکدانەوەیەکی سیاسییە و قۆناغێکی شەڕ دژی قەیسەر پێشان دەدات. پەسەندکردنی ئەو بیرۆکەیە نابێتە هۆی کەمتر کردنەوەی نرخی ئەو هەڵسەنگاندنە درێژخایەنانە سەبارەت بە شانۆنامەکە کە وەك یەکێك لە دراما مێژووییە مەزنەکان ناوی دەبەن و تێیدا هێز و کاریگەری تراژیدی بەدی دەکرێ. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە کارەکتەرو ڕووداو رۆڵی لاوەکیان هەبێ. شەکسپیر ئەمەی وەك درامانوس نووسیوە نەك وەك مێژوونووس. بەڵام لەوانەیە شەکسپیر قوڵتر لە شتەکان بڕوانێت.

* * *

## پەراوێز

١- پلوتارخ: مێژوونووسێکی گریکی کۆنە ژیاننامەی زۆر لە ناودارانی گریکی و رۆمانی نووسیوەتەوە. شەکسپیر ئەو ژیاننامەی پلوتارخی وەك سەرچاوەیەکی سەرەکی و بنەڕەتی لە شانۆنامەکەی بەکارهێناوە.

٢- کلایماکس: خاڵێکی تایبەتییە لە شانۆدا کە تێیدا ڕووداوەکان دەگەنە لوتکە، یاخود دەتوانین بڵێین کە بەرزترین خاڵی نەخشەی دراماییە.

٣- کابتول: باڵەخانەی دادگاو گۆڕەپانەکەی دەگرێتەوە.

## سەرچاوەکان:


١- Bradly، A.C، Shakespearean Tragedy، ١٩٦٦.

٢- Brodie ،J.، Notes on Shakespeare’s Julius Caesar، ١٩٧٦.

٣- Turner،W.Julius caesar، ١٩٧٤.

٤- Wilson، J.D. julius Caesar، Cambridge University press.




## ((شالیر))ی شەکسپیر: هەڵسەنگاندنێك

هەرچەندە شانۆنامەی (شالیر) بە یەکێك لە تراژیدیا مەزنەکانی شەکسپیر دادەنرێت، بەڵام ئەم شانۆنامەیە زۆر ڕەخنەی ئاراستەکراوە. ئەم ڕەخنانەش تارادەیەك بەهێزترن لەوانەی ئاراستەی شانۆنامەکانی تر کراون. هەندێ ڕەخنەگر لەو باوەڕەدان کە شانۆنامەی (شالیر) دەست پێکی بەرەو نەمان چوونی بلیمەتی شەکسپیری شانۆنوس پیشان دەدات. لە شانۆنامەی (هاملێت) لەسەر زاری میری دانیمارك شەکسپیر پێمان دەڵێت:

**((ئەرکی شانۆ بریتییە لە ئاوێنە دانان بەرامبەر سروشت)).**

بەڵام زۆربەی ڕەخنەکانی شانۆنامەی (شالیر) ئەوە دووپات دەکەنەوە کە چەندین ڕووداو و کارەکتەر هەن کە ڕوودان و بوونیان لە ژیانی ڕاستەقینەدا مەحاڵە. گەر ئەمەش ڕاست بێت ئەوا شەکسپیر بەپێی یاساکانی خۆی ئیدانە دەکرێت. بە مەبەستی زیاتر ووردبوونەوە لە کارەکتەرو ڕووداو و دایەلۆگەکان و ڕادەی بوونیان لە ژیانی ڕاستەقینەدا، با بەیەکەوە چاوێك بە شانۆنامەکە بخشێنین.

دەبێ ئەوە لەیاد نەکەین کە ناتوانین و پێویست ناکات حوکم لەسەر ڕووداوەکانی شانۆنامەکە بدەین بە بەراوردکردنیان لەگەڵ شارستانیەتی سەردەمی شەکسپیر خۆی. هەندێ خوێنەر لەوانەیە پێی وابێت کە کارەکتەری وەك گۆنرال (Goneril)و ڕێگان (Regan)، هەردوو کچەکەی لیر، لە ژیانی ڕاستەقینەدا بەدی ناکرێن. زیاتریش ڕووداوی دەرهێنانی چاوی گلۆسستەر (Gloucestor) هەتا لە ژیانی دڕندایەتیدا ڕوودانی مەحاڵە.

لەم شانۆنامەیەدا شەکسپیر ئێمەی خوێنەر لەگەڵ خۆیدا بۆ ((چاخە تاریکەکان*)) دەگەڕێنێتەوە.

ئینگلتەرا لەو سەردەمەدا وولاتێکی بێ ئایین بوو بۆیە هەڵس و کەوتی خەڵکی بەرەڵلایی و دڕندەیی پێوە دیاربوو. ئەو کەسانەی ئێمە لەو شانۆنامەیەدا دەیانبینین دڕندەو بێ بەزەیی و سەرەتایین. مێژووش هەندێك لە تایبەتمەندییەکانی مرۆڤی ئەو سەردەمەمان بۆ دیاری دەکات و دووپاتیان دەکاتەوە. لەو سەردەمەدا ژیان بێ قودسیەت بوو. تاکە یاسای بەڕێوەبردن یاسای جەنگەڵ بوو. کە یاسایەکی ددان و چرنوك خوێناوی بوو. لەو سەردەمەی پێش مەسیحییەت حوکمڕان خاوەنی بەهێزترین بازوو و تیژترین شمشێر بوو. ئەگەر چاوێك بە مێژوودا بخشێنین دەبینین ئەو ڕووداوو کارەکتەرانەی شەکسپیر باسیان دەکات، لەو سەردەمەی مێژوودا هەبوون و ڕوویان داوە. بەم شێوەیە شەکسپیر لە دروست کردنی کارەکتەری وەك گۆنریل و ڕێگان لە سنووری مەحاڵ نزیك نەکەوتۆتەوە. بەکورتی دەتوانین بڵێین کە لە سەردەمی پێش مەسیحییەت خەڵك زۆر دڕندەو بێ بەزەیی بوون.

گۆتێ (Goethe)ی ڕەخنەگر سەبارەت بە شانۆنامەی (شالیر) دەڵێت شانۆنامەکە بەندە لەسەر هەڵس و کەوتی مەحاڵی شا و کۆردیلا (Cordelia) لە دیمەنی یەکەم دا. هەندێ کەس پێیان وایە لیر پێشتر مەملەکەتەکەی دابەشکردووە، بەڵام لیر ئەم دابەشکردنە بە مەرجێکی سەیر دەبەستێتەوە، ئەویش دەربڕینی خۆشەویستی و دڵسۆزی ڕووبەڕوو و ئاشکرایە بۆ لیری باوك لەلایەن هەرسێ کچەکەی (گۆنریل، ڕێگان، کۆردیلا). گۆنریل و ڕێگان هەردووکیان بە ساختە و ناپاکی باوکیان بە قسەکانیان فریو دەدەن بۆیە لیر لە پاداشتی ئەو درۆیە بەشێکی مەملەکەتەی بە هەریەکەیان دەبەخشێت. بەڵام کۆردیلا کچە بچووکی لیر بە ڕاستۆگیی و بێ پێچ و پەنا هەستی خۆی بەرامبەر لیری باوك دەردەبڕێت و ئەمەش دەبێتە هۆی توڕەبوونی لیر و بڕیاردانی دوورخستنەوەی کۆردیلا بێ ئەوەی هیچ پارچە زەوییەکی پێ ببەخشرێت. کاتێك کێنت (Kent)ی ڕاوێژکاری لیر ویستی بەرگری لە کۆردیلای زوڵم لێکراو بکات، لیر بڕیاری دوورخستنەوەی ئەویش دەدات، هەرچەندە (کێنت) ڕاوێژکارێکی دڵسۆزو ژیر بوو. ئایا لەو کاتەدا لیر لە سەرەتای شێتیدایە بۆ ئەوەی



لێپرسراوی کردەوەکانی نەبێت؟ وەڵامی ئەم پرسیارە دواتر ڕوون دەبێتەوە، چونکە شەکسپیر هەرگیز پیاوێکی شێت ناکات بە پاڵەوانی شانۆنامەکانی ئەگەر مەرامی درامیی تێدا بەدی نەکات. ئێستا تەنها دەتوانین بە هەڵس و کەوتەکانی لیر ڕازی بین هەرچەندە مەحاڵیش بن تا ئەو کاتەی دەچێتە ناو ڕووداوەکانی شانۆنامەکە.

لیری باوك وا دەردەکەوێت کچەکانی خۆی بە چاکی نەناسێت، بەڵام پێدەچێت کۆردیلا باوکی چاك بناسێت، ئەو باوکەی کە وەك کەسێکی کەللەڕەق دێتە بەرچاو هەندێك لە ڕەخنەگران پێیان وایە کۆردیلا نە بەتەواوی بێ گوناهەو نە بە تەواوی گوناهبارە. کۆردیلا لە قسەو دەربڕینی هەستەکانیدا لە ڕادەبەدەر بێ پێچ و پەنایەو تا ڕادەیەك لەگەڵ ژیانی ئاسایی ناگونجێت، ئەو ژیانەی کە پێویستی بە وەرگرتن و بەخشین هەیە.

بەهەمان شێوە لە چیرۆکی لاوەکی شانۆنامەکە دووبارە کارەکتەرو ڕووداوەکان ڕووبەڕووی کێشەی مەحاڵێتی دەبنەوە. ئیدمۆند (Edmund)ی کوڕی گلۆستەر کەسێکی ناپاك و زۆر ناڕەسەنە بەرامبەر باوکی خۆی. ئێدگار (Edgar)ی کوڕی گلۆستەر زۆر بە ئاسایی گوێ بۆ درۆیە هەڵبەستراوەکانی ئیدمۆندی زڕ برای شل دەکات، لە کاتێکدا کە پێویست بوو بەرامبەری بوەستێت و بەرگری لە شەرەفی بکات کەچی ڕادەکات. کەسێکی تۆزێك بە جەرگ و ئازا ڕووبەڕووی ئیدمۆند دەبوەوە، بەتایبەتی کەسێکی بێ گوناهی وەك ئێدگار. ئەو لاوازیەی ئێدگار لەو کاتەدا بە تەواوی دژی ئازایەتی ئێدگارە لە دواین بەشی شانۆنامەکە. لێرەدا دەبینین شەکسپیر لە دروست کردنی کارەکتەردا ناجێگیرە، ئەمەش ڕەخنەیە کە زۆر جار ئاراستەی شەکسپیر کراوە. گلۆستەر بەبێ بەڵگەی ئاشکراو تەنها لەبەر درۆ هەڵبەستراوەکانی ئیدمۆندی ناڕەسەن یەکسەر ڕق و کینە لە ئێدگار هەڵدەگرێت.

ئەو کەم و کوڕیانە وا دەکەن نەتوانین بە تەواوی شانۆنامەی (شالیر) بخەینە ڕیزی تراژیدیا مەزنەکانی وەك (ماکبیپ)، (هاملێت) و ( ئۆتێللۆ). بەڵام لەوانەیە شەکسپیر لە پشت هونەرە بەهێزو کاریگەرەکەی مەرامێکی درامیی لە خەیاڵدابێت. ئەگەر چاو لە ڕووداوە مەحاڵەکانی سەرەتای شانۆنامەکە بپۆشین ئەوا دواتر ڕووداوەکان بە ئاسانی بەدوای یەك دا دێن.

شانۆنامەی (شالیر) وەك هەموو تراژیدیاكانی تر دەوروبەرێكی تاریك و غەمناكی تێدا پیشان دەدرێت، تێیدا سزای تاوان و هەڵە ئاماژەی بۆ دەكرێت. شانۆنامەكە بە توانایی و بەهێزی قەدەر (Karma) پیشان دەدات. لەم شانۆنامەیەدا بەشێوەی تراژیدیاكانی تر، هەست دەكرێت كە پاڵەوان لەنێو دەستی چەند هێزێكی دەرەكی دایە، بەڵام ئەمەش نابێتە هۆی كەمتر كردنەوەی لێپرسراوێتی لیر بەرامبەر كردەوە ناڕاستەكانی چونكە (لیر)یش وەك ماكبێت خۆی ڕێگەی نەمان و لەناوچوون هەڵدەبژێرێت. شەكسپیر لە یەكێك لە بەرهەمەكانی نووسیویەتی:

**((لە هەندێ كاتی ژیاندا چارەنووس لەدەست مرۆڤ خۆیەتی))**

هەروەها لەم شانۆنامەیەدا شەكسپیر نایەوێت لیر و گلۆسستەر وەك دوو كارەكتەری بەدبەخت و بێ گوناە پیشان بدات، هەرچەندە گلۆسستەر لە شوێنێكی شانۆنامەی (شالیر) دەڵێت:

**((ئێمە مرۆڤ بە دەستی خواوەندەكانەوە وەك باڵندەی دەستی منداڵانین كە بە مەبەستی یاری كردن دەمانكوژن))**

ئەمەش ئەو بیردۆزەی ژیان نییە كە شەكسپیر لایەنگیری لێدەكات، چونكە گلۆسستەر بە تەواوی بێ لۆمە نیە. هەرچەندە گلۆسستەر دژی مامەڵەی خراپی كچەكان بەرامبەر لیری باوك وەستا بەڵام لەسەر ئەمە زۆر توند نەبوو و هەر زوو وازی هێنا، ئەگەر بەهێزتر بووایەو بەرەنگاری كچەكان بووایە لەوانە بوو لیر دەربازی ببا. زیاتریش دڵدانەوەی لیر لەلایەن گلۆسستەر بەهۆی چەند هۆكارێكی سیاسی هاتە بوون، ئەویش كاتێك گلۆسستەر زانی كە سوپای فەرەنسی كە كۆردیلای لەگەڵ دایە وا بەرەو پێش دێت. بەڵام تاوانی سەرەكی و بنەڕەتی گلۆسستەر لەو خۆشەویستییە نایاساییە بوو كە ئاكامەكەی لە دایك بوونی ئیدمۆند بوو. بەم شێوەیە گلۆسستەر سزا دەدرێت و چاوەكانی لەدەست دەدات و دەڵێت:

**((خواوەندەكان دادوەرن، لە خراپەكانی خۆمان،كەرەستە دروست دەكەن بۆ نەفرەت لێكردنمان.))**



ئیدمۆند خۆی كاری ئاسایی سروشت پیشان دەدات. بەهەر شێوەیەك بێت ئیدمۆند دەیەوێت بگاتە ئامانجەكانی بۆیە هەموو كۆتەكانی ئەخلاقی و كۆمەڵایەتی دەشكێنێت و هەر كاتێك نزیكی سەركەوتن دەبێتەوە، هەموو نەخشەكانی وەك خانووی لە كاغەز دروست كراو دادەڕوخێت. ئیدمۆند بەهۆی عەدالەتی شیعری (Poetic justice) چارەنووسی دەكەوێتە دەست ئێدگار چونكە زۆری درۆ بۆ هەڵبەستبوو.

(لیر)یش هەمان ڕاستی — عەدالەتی شیعری — پیشان دەدات. هەموو ناخۆشی و نەهامەتی و ئەو كارەساتانەی بەسەردا دێت، هەموویان دەرئەنجامی حوكمی ناڕاستی خۆیەتی لەسەر كچەكانی لە دیمەنی یەكەمی شانۆنامەكە.

بەهەمان شێوە گۆنریل و ڕێگان بە سزای خۆیان دەگەن و دەكەونە ناو چاڵەكانی خۆیان. زیاتریش ملیان لە تۆڕی ئەو پیلانانە دەئاڵێت كە بۆ كەسانی تر دایان نابوو.

دەبینین لە كارەكتەرە بەرچاوەكانی شانۆنامەكە تەنها ئێدگاری بە ساختە شێت لە سزا دەرباز دەبێت چونكە تا ڕادەیەكی زۆر بێ گوناە بوو. سەرەكیترین گوناە و تاوانی ئێدگار خۆش باوەڕی و ویستی سوارچاكی بوو ئەمانەش گوناهی زۆر بچوكن ئەوە ئەگەر هەر بە گوناە بژمێردرێن.

بە ووردبوونەوە لە شانۆنامەكانی شەكسپیر عەدالەتی شیعری بەدی دەكرێت، بۆیە ڕوونكردنەوەی كۆتایی‌یە تراژیدی‌یەكەی كۆردیلا زەحمەتە گەر لەگەڵ بیروبۆچوونی شەكسپیر بەرامبەر بە عەدالەت بەراوردی بكەین. سزای كۆردیلا، كە مردنە، زۆر زیاترە گەر بەراوردی بكەین لەگەڵ هەڵە بچوكەكەی بەرامبەر لیری باوك. بەڵام كۆردیلا تەواو بێ گوناە نەبوو چونكە قسە بێ پێچ و پەنایەكانی بەرامبەر لیری باوك كاریگەرییەكی بەدبەختانەی لەسەر لیر دەبێت و بەهۆیەوە هەموو مەملەكەتەكەی دەبەخشێت بە گۆنریل و ڕێگان. كۆردیلا بە هەڵە هەڵس و كەوتی كرد شەكسپیریش وا پیشان دەدات كە ئەو هەڵەیە هێندەی تاوانێك كاریگەری و دەرئەنجامی خراپی هەبوو. قسە ڕەقی و هەڵس و كەوتە هەڵەكەی كۆردیلا هۆی بنەڕەتی هەموو كارەساتەكانی شانۆنامەكە بوون، بۆیە كۆردیلا ناتوانێت لەژێر باری قورسی لێپرسراوێتی

کارەساتەکان بێتە دەرەوە. بەم شێوەیە کۆردیلا سەرباری بێ گەردی رۆح و پاکی بیرکردنەوەو سروشتی لێبوردوانەی بە چارەنووسی خۆی دەگات.

لەم شانۆنامەیەدا بیردۆزی ژیان هەمووی لە میتافۆرێك (Metaphor) بە ((گالیسکەی بەخت)) (The wheel of fortune) کورت کراوەتەوە. هەڵەیەك، تاوانێك یاخود حوکمێکی ناڕاست لەسەر رووداو و کارەکتەر لەوانەیە سزای یەکسەری نەبێت، بەڵام دەکەوێتە سەر پێچکەی ((گالیسکەی بەخت)) و لەگەڵ تەواوکردنی هەر خولێك نۆرەی پێداچونەوەی دێتەوە. ئەوەتا ئیدمۆند لە ووشەکانی سەرەمەرگی دا دەگاتە ئەو ئەنجامە و دەڵێت:

**(( پێچکەکە خولێکی تەواوکرد، ئەوەتا من لێرەم. ))**

دەتوانین ئەو بیرو بۆچونانەی سەرەوە بەشێوەیەکی تر بخەینە روو، وەك چۆن پرۆفیسۆر ئەلاردیس نیکۆل (Allardyce Nichol) دەڵێت ((شەکسپیر بڕوای بە عەدالەتی شیعری نەبوو. شەکسپیر پێی وایە دراما ئاوێنەی ژیانی ڕاستەقینە نیە، ئەو ژیانە کە تێیدا هەموو چاکەو باش- ڕەفتارێك پاداشت بکرێ و دواتر ژیانێکی پڕ خۆشی بباتە سەر و خراپ-ڕەفتارو گوناهباریش بە پێی جۆری گوناهـ سزا وەربگرێت)). بەڵام شەکسپیر پێدەچێت لەو باوەڕەدا بێت کە هێزە دەرەکی و بەتواناکانی سەرووی دەسەڵاتی ئێمە چاو لە چاکە و خراپە دەپۆشن و پاداشت و سزا بە شێوەیەکی هەڕەمەکی دابەش دەکەن. ئەگەر ئەمەش ویستی شەکسپیر بێ ئەوا ئاوێنەیەکی ساختەی بەرامبەر سروشت داناوە چونکە لەو ژیانە نایەکسانەی مرۆڤ دا خەڵکی باش — ڕەفتارو شایستە تقومی بەدبەختی و نەهامەتی دەبێت، کەچی بەدڕەفتار و ناپاك وەك درەختی تازە پێگەیشتوو گەشە دەکات. هەر چۆنێك بێت لە تێکڕای تراژیدیاکانی سزا زیاترە وەك لە پاداشت. هەموو سزاکان بۆ پاڵەوانە گوناهبار و بەدبەختەکانن کە بەهۆیەوە لەناودەچن.

هەندێك لێکۆڵەرەوە پێیان باشە وا سەیری شانۆنامەی (شالیر) بکەن کە درامایەکە مامەڵە لەگەڵ کەللەڕەقی دەکات وەك چۆن (ماکبێت) درامای چاوچنۆکی و (ئۆتیللۆ)ش درامای حەسودیە. هەڵەی سەرەکی و بنەڕەتی لیر لەوەدایە کە بێ توانایە



لە حوکم دانی ڕاست لەسەر کارەکتەرەکان بە تایبەتی کچەکانی خۆی. پێویستە ئەوەش بزانین کە لیر زۆر زیاترە لە تەنها پیرە پیاوێکی شێت بوو.

شەکسپیر هیچ هەوڵی نەداوە بۆ دروست کردنەوەی ڕەنگ و زمان و هەڵس و کەوتی بەسەرداچوی مێژووی لیر. لەوانەیە شەکسپیر شارەزایی لەو سەردەمەی مێژوودا نەبووبێت یان پێی وابووە بینەر یان خوێنەر تێیان ناگات. لەم شانۆنامەیەدا چەند جیاوازیەکی زەمەنی و مێژوویی بەدی دەکرێت و هەموویان ئەو ڕاستیە دووپات دەکەنەوە کە شەکسپیر خۆی ماندوو نەکردووە بۆ گەڕان بەدوای ووردەکاری مێژوویی، ئەمانەی خوارەوەش چەند نمونەیەکن:

١- بۆ دەست گیر کردنی ئێدگار، گلۆستەر وا پێشنیار دەکات وێنەی ئێدگار بە شەقامەکانی شاردا بگێڕن، بەڵام ئەم شێوازەی گەڕان بەدوای تاوانباران تازەیە و هەرگیز ناشێت لەو سەردەم دا لە ئارادا بووبێت.

٢- شەڕەکەی نێوان ئێدگار و ئیدمۆند وا وەسف کراوە کە بەپێی یاساکانی شەڕ ئەنجام دراوە کە لەلایەن سوارچاکە (نۆرمانی *)یەکاندا هێنرابوو، هەردەم بوق لێدەر زەنگی شەڕ لێدەدا.

٣- ئاماژە کردن بۆ بەکارهێنانی چاویلکە لە بەشی یەکەم دیمەنی دووەمی شانۆنامەکە لە یەکێك لە قسەکانی گلۆستەر. بەڵام چاویلکە تا ساڵی (١٣٠٠ز ) نەدۆزرابوەوە.

٤- لە بەشی یەکەم دیمەنی چوارەم باسی داب و نەریتێکی کاتۆلیکیەکان کراوە کە بریتیە لە ماسی خواردن لە ڕۆژانی هەینی. بەڵام ئەم دابونەریتە بە ماوەیەکی زۆر پێش مەسیحییەت هاتۆتە ئینگلتەرە.

ئەمانەی سەرەوە تەنها هەندێکن لەو نموونانەی لەم شێوەیە لە شانۆنامەکەدا بەدی دەکرێت. بە کورتی دەتوانین بڵێین کە لە کاتێ شانۆنامەکە باسی سەردەمێکی ناشارستانی دەکات کەچی دەبینین داب و نەریت و هەڵس و کەوت و جل و بەرگەکان دەگەڕێنەوە بۆ سەردەمی ئەلیزابێتی یان بەلای کەم دەگەڕێنەوە بۆ ماوەیەکی زۆر پاش چاخە تاریکەکان.

بەم شێوەیە دەبینین شانۆنامەکە هەڕەمەکی و ناجێگیریی پێوە دیارە. هەڵبەت شەکسپیر مامەڵەی لەگەڵ سەردەمێك کردووە کە خاوەن مێژوویەکی نادیار و تۆمار نەکراوە. بۆیە شەکسپیر بە پێویستی زانی سەربەستی بدات بە خەیاڵی خۆی بۆ بەڕێوەبردنی ڕووداوەکان و دروست کردنی کارەکتەرەکان. هەڵس و کەوت و جل و بەرگ و داب و نەریتەکانی لە سەردەمی ئەلیزابێتی دەچن نەك لەو سەردەمەی کە چیرۆکی لیری ڕاستەقینەی تێدا ڕوودداوە. لێرەدا بە پێویستی دەزانم باسی ئەو لایەنانەی کارەکتەری ئەلیزابێتی بکەم کە لەم شانۆنامەیەدا بەدی دەکرێت. سەرەکیترین خاڵ بریتییە لە بڕوای پتەو بە خورافیات، کە لەم شانۆنامەیەدا بەهۆی باسکردنی هێزی دەرەکی و کاریگەری ئەستێرە لەسەر ژیانی مرۆڤ ئاماژەی بۆ کراوە. جل و بەرگ و هەڵس و کەوتی کەسانی ناو کۆشك پیشان دراوەو دواتر سەرزەنشت کراوە.

ڕۆحی نیشتمانپەروەری ئینگلیز تەنها لە یەك شوێن نیشان دراوە. چونکە شەکسپیر پێی وابوو پێویستە چەند ڕوونکردنەوەیەك بخاتە ڕوو بۆ ئامادەبوونی سوپای فەڕەنسی لەسەر خاکی ئینگلیز، بە مەبەستی درکاندنی ئەو ڕاستییەی کە شەڕەکە بەهۆی ڕکابەری شەخسی ڕوویداوە نەك نەتەوەیی. شەکسپیر مامەڵەی لەگەڵ سەردەمێك کردووە کە تەنانەت لە سەردەمی خۆی واتە سەدەی شانزەهەمیش مێژوویەکی کۆنی هەبووە. گەر شەکسپیر شێوە جل و بەرگ و هەڵس و کەوتی سەردەمەکەی خۆی بخاتە پاڵ کەسانێك کە لەو سەردەمەدا نەژیابن ئەوا خوێنەر یان بینەر بە ئاستەنگ دەتوانێت ئەوە جیا بکاتەوە کەی شەکسپیر بە ڕاستگۆیی ڕووداوە مێژووییەکانی تۆمار کردووەو کەی پشتی بە خەیاڵی خۆی بەستوە. لەم شانۆنامەیەدا دەتوانین زۆر بە ئاسانی هەندێ لە شێوە جل و بەرگ و هەڵس و کەوتی خەڵکی سەردەمی ئەلیزابێتی بدۆزینەوە، بەڵام ئەمە نابێتە سەرچاوەیەکی متمانە پێکراو بۆ ئەو کەسانەی کە بە دوای زانیاری ووردی ئەو سەردەمەدا دەگەڕێن.

شەکسپیر لە شانۆنامە سەرەتاییەکانیدا زیاتر بیری لە ڕووداوی خۆشی بەخش کردۆتەوە نەك کارەکتەرو نەخشە. لە کۆمیدیاکانی دا زیاتر بایەخ بە کارەکتەر و نەخشە دەدات.



ئەوەتا لە کۆمیدیاکانی وەك (چۆن حەز دەکەی) (As you like It) و (دوانزەهەمین شەو) (The Twelfth Night) و (بازرگانی ڤینس) (The Merchant of Venice) کێشەیەکی دیاری کراو دەخرێتە ڕوو بۆ چارەسەرکردن، بەڵام خوێنەر یان بینەر بە گومانەوە بەجێ دەهێڵرێت سەبارەت بە چۆنیەتی چارەسەر. لە تراژیدیاکانی دا چەند بەڵگەیەك هەن بۆ سەلماندنی بایەخ دان بە نەخشە بەڵام هیچ بەڵگەیەك نییە بیسەلمێنێت کە کارەکتەر بایەخی زۆری پێدرابێت. شانۆنامەی (شالیر) بەشێوەیەك ڕێکخراوە کە کاریگەری زنجیرەیەك ڕووداو لەسەر مێشکی لیری کەللەڕەق پیشان بدات نەك ئەو کێشانەی تەشویق دروست دەکەن.

شەکسپیر لە سەرەتادا چیرۆکی لیر سەرنجی ڕاکێشاوە. دواتر هەوڵی دروست کردنی کارەکتەر و ڕووداوی داوە بە گونجان لەگەڵ بیرۆکەی سەرەکی کە بریتییە لە ناسوپاسگوزاری و ناپاکی ڕۆڵە بەرامبەر باوك و کاریگەری ئەمەش لەسەر شێت بوونی باوك پیشان دەدرێت. دەبینین شەکسپیر دڵنیا نییە لەوەی کە ئەو چیرۆك و کارەکتەرانە بە تەنها سەرکەوتوو دەبن بۆیە بڕیار دەدات چیرۆکی گلۆستەری هاوشێوە بخاتە ناو شانۆنامەکە بە مەبەستی زیادکردنی کاریگەری و پتەوتر کردنی بیرۆکە سەرەکییەکە. چیرۆکی سەرەکی و لاوەکی بە توندی بەیەکەوە لکێنراون و پێکەوە هاوسەنگی شانۆنامەکە دەپارێزن و ڕووداوەکان بەرەو مەرامی درامیی کۆتایی دەبەن. کارەکتەری هەردوو چیرۆك بەیەکەوە یەکگرتوویی ڕووداو لەم شانۆنامەیە تەواو دەکەن.

**پەراوێز:**

چاخە تاریکەکان (Dark Ages): لە ئەوروپادا لە سەدەی شەشەم تا سەدەی دوانزەهەم دەگرێتەوە. (وەرگێڕ).

*نۆرمانی (Normans): گەلێك بوون لە باکووری فەڕەنسا دەژیان، لە سەدەی یانزەهەم دا دەستیان بەسەر ئینگلتەرە دا گرت. (وەرگێڕ).

**سەرچاوە:**

**پەرتوك** ((King Lear)) **نووسەر** (Willia Turner) **لاپەڕە (٤١-٣٤)**



## سروشت و کاریگەریی ((گەرداوەکە))ی شکسپیر

گومان لەمەدا نییە کە ئەلیزابێتییەکان باوەڕیان بە شتی خەیاڵی هەبووە وەك ((تارمایی، سیحر،... تاد.)) بە ڕادەیەك پایەبەرزترین کەسانی ئەو سەردەمەی وەك شاژنە ئەلیزابێت و جەیمس پاشای یەکەم باوەڕێکی پتەویان هەبوو بە توانای ساحیرو شەیتانەکان بۆ کارکردنە سەرچارەنووسی مرۆڤ. بۆیە جێی سەرسامی نییە کاتێ دەبینین ئەو کاتە باوی خورافیات و خەیاڵ ئامێزی کردارەکان بوو. ئەمەش واتە ئەم بەربڵاوییە یارمەتیدەرە لە ڕوونکردنەوەی باس کردنەی جنۆکەکان لە شانۆنامەی ((خەونی نیوە شەوێکی هاوین))، تارمایی باوکی هاملێت لە شانۆی ((هاملێت)) و ساحیرەکان ((جادووگەرەکان)) لە شانۆگەریی (ماکبێت). بە هۆی ئەزموون و سەرکەوتنەکانی شەکسپیر زانی کە ئەلیزابێتییەکان حەز لە ((ڕۆمانس)) دەکەن کە باس لە کەسێکی سەرنجراکێش دەکات. مەبەستی شەکسپیر لە نمایش کردنی شانۆگەرییەکانی بریتی بووە لە سەرکەوتن، ئەمەش بە تێگەیشتن لە چێژی جەماوەر جێبەجێ دەبێ.

بۆیە دەبینین شەکسپیر بەسەرهاتە کۆنەکان و تازەکانی تێکهەڵدەکێشێ بە مەبەستی دەستکەوتنی بەرهەمێکی تازە.

لە دیدگەی کەسانی سەدەی بیستەمدا بوونی کەرەستەی خورافی (ئاسایی بەدەر) لەوانەیە بە خاڵێکی لاواز دابنرێ، چونکە باوەڕیان پێ نییە و لەوانەشە بەو هۆیە هەندێ بە ناشیاوی دابنێن، بەڵام ئەو ڕەخنەیە هیچ بایەخێکی نابێ گەر

سەردەمی نووسینی ((گەرداوەکە)) لەبەر چاو بگرین، چونکە ئەو کاتە کەرەستەی ((ئاسایی بەدەر)) جێی سەرنجی جەماوەر بووە. سەرەڕای ئەوەش زۆر پێویست نییە بۆ پێکهاتەی درامیی شانۆنامەکە بە بەراوردکردنی لەگەڵ ڕۆڵی جنۆکەکانی((خەونی نیوە شەوێکی هاوین))، ساحیرەکانی ماکبێت و تارماییەکەی شانۆنامەی ((هاملێت)).

زۆر ئاسایی دەبوو گەر پاپۆڕەکە بە گەرداوێکی ئاسایی تێکشکابوایە و فڕێ درابوایە سەر ئەو دوورگەیە. ئاسایی دەبوو گەر ((میراندا)) و ((فێردیناند)) بە شێوازێکی ئاسایی بکەونە داوی خۆشەویستی. ئاسایی دەبوو گەر ((پرۆسپیرۆ)) بەبێ یارمەتیی سیحر بەسەر دوژمنەکانیدا زاڵ بووایە، لەبەر ئەوەی ((گەرداوەکە)) بەم شێوەیە نووسراوە، ئەوا ئەگەری شیاوێتیی ڕووداوەکانی کەمتر بۆتەوە لە دیدی خوێنەری هاوچەرخدا ((تازەدا))، بەڵام شەکسپیر بۆ خوێنەری ئەم سەردەمەی ئێستا نەنووسیەوە، بەڵکو بۆ ئەلیزابێتییەکان کە زۆر پەرۆش بوون بۆ بەسەرهاتی دوورگە ئەفسووناوی و سیحراوییەکانی دەریا نەناسراوەکانە جەماوەری ئەو کاتە کەشێکی سیحراویان دەویست بۆیە شەکسپیریش بۆی دابین کردن هەر ئەمەش هەلی بۆ شەکسپیر ڕەخساند هەردوو کارەکتەری ((ئاریەل)) و ((کالیبانی)) زیاد بکا بۆ شانۆنامەکە کە بایەخی بەرهەمەکەیان زیاتر کردووە.

درامای شەکسپیری هەردەم درامایەکە بۆ کەسایەتی و کارەکتەر و ڕووداوی درامایەکە هەردەم بە شتە تایبە و نائاساییەکانی کارەکتەرەکانی ڕوون کراوەتەوە. چەمکی شەکسپیر بۆ پاڵەوان ئەوەیە کە سروشتی کارەکتەرەکە خۆی دەبێتە هۆی تراژیدیا و کارەساتەکە.

بە گشتی شەکسپیر کەسێکی پایە بەرز و باش ڕەفتار و بە ناوبانگی هەڵدەبژارد کە تەنیا یەك خاڵی لاوازی لە کەسایەتیدا هەبوو کە ئەمەش دەبووە مایەی هێرشەکانی چارەنووس. ((ئۆتێللۆ)) زۆر چەکۆس (حسود) بوو ئەمەش بووە هۆی ڕووخانی. ماکبێت زۆر چاوچنۆك بوو ئەمەش بووە هۆی ڕووخانی.



لەگەڵ ئەوەشدا کەرەستەی بە هێزی ((چارەنووس)) هەیە کە کارەکتەرەکە ناتوانێ ڕزگار بێ لە دەست دەرئەنجامەکانی چارەنووس کە هەڵەکانی خۆی هۆی سەرەکی بوون. ئەمەش وای کردووە هەندێ پێیان وابێ (( لای شەکسپیر کارەکتەر واتە چارەنووس)) بە شێوەیەکی تر دەتوانین بڵێین زنجیرە کارەساتەکە بە هۆی هەڵەو تاوانەکانی پاڵەوان دەست پێدەکات. دوای ئەوەش گەڕانەوە و لێبووردنی نیە. دەبێ نرخە قورسەکە بدرێ کە لە دیمەنی کۆتایی ((هاملێت))، ((ئۆتێللۆ)) و ((لیر)) و ((ماکبیت)) بەدی دەکرێ.

بە هەمان شێوە وانەی کارەکتەر لە ((گەرداوەکە)) دا هەیە، چونکە هۆی لە دەستدانی مەملەکەتەکەی دەگەڕێتەوە بۆ پشتگوێ خستنی بەرپرسیاریەتییەکانی پرۆسپیرۆ خۆی هەرچەندە ئەمە پیشان نەدراوە لە سەر تەختەی شانۆ، بەڵام بە هۆی گفتوگۆیە دووردودرێژەکەی نێوان پرۆسپیرۆ و میراندا پەردەی لەسەر لادەدەرێت. دەردەکەوێ پرۆسپیرۆ کەسێکی تەواو ڕۆشنبیرە و ئاگادارە لە هەڵەکانی پێشووی خۆی و بە پەرۆشە بۆ ڕاستکردنەوەی ئەو هەڵانە. دەبینین لە کۆتاییدا ئەمە دەکا و دووبارە دەگەڕێتەوە بۆ سەر تەختی پاشایەتی بۆ ئەوەی ببێ بە حوکمڕانێکی نموونەیی. ڕەنگە ئەوەی کەمێك کاریگەریی ئەوەی کەم کردبێتەوە بریتی بێ لەو ڕاستییەی کە پرۆسپیرۆ بە هۆی سیحر ئەم شتانەی گێڕایەوە ژێر دەستی خۆی، بەڵام ڕاڤەکردنی ڕووداو یاخود کردار لە دیدگەی کارەکتەرەوە لەم شانۆنامەیەدا هاوشێوەیە لەگەڵ تراژیدیاکانی تر.

بەڵام تەنیا یەك خاڵ هەیە کە شانۆنامەی ((گەرداوەکە)) جیادەکاتەوە لە ئەوانی تر. پاڵەوانی تراژیدیاکان هەموویان بە هۆی هەڵە و تاوانەکانی پێشوو ئازارو ناخۆشیان چەشتووە. بە هۆی کەللەڕەقی دەبوو ((کۆردیلا)) بمرێ، بە هۆی ساویلەکەیی لە تێڕوانینی دیزدەمۆنای پاك خنکێنرا. لە شانۆنامەکانی زوودا کە دەکەونە خانەی تراژیدیا پێدەچێ شەکسپیر هەردەم ئەو وانەیەمان پێ بڵێ کە لەو جیهانەدا هەلی دووەم بە کەس ناردێ هەروەها تاوان و هەڵە دەبێ سزای بەدوادا بێ

بە هۆی یاسایەکی بێ بەزەیی و دادوەر. لە هەموو تراژیدییە رۆمانتیکییەکانی چارەنووس بەدێ دەکرێ، هەست کردن بە هێزێك و توانایەکی لە رادەبەدەر کە لە دەست مرۆڤدا نییە و پاڵی پێوە دەنێ بەرەو رێگای رووخان و لە ناوچوون. لێرەدا کەشێکی گریکی لە واتای چارەنووس بەدی دەکرێ. گریکییەکان پێیان وابوو کە پاڵەوانی تراژیدی کەسێکی ماقووڵ و بە ناوبانگە کە ملکەچی چارەنووسێکی خراپ بوو بە هۆی بەختێکی خراپ یان وەك چۆن خۆیان راڤەی دەکەن بە هۆی چەکۆسی (حسود)ی خواوەندێکی شەڕانگێز. پاڵەوانە تراژیدیای گریکی بە بێ هەڵەی خۆی بەرەو لە ناوچوون دەچێ، بەڵام شەکسپیر وا دەکا هەڵەکانی پێشوو ببنە دەستپێك بۆ هێنانە سەر ئەو رێگایەی کە بەرەو نەمان دەیبات بە شێوەیەکی تر دەتوانین بڵێین دراماکانی شەکسپیر بە تەواوی تراژیدیای کارەکتەر یان چارەنووس نین، بەڵکو تێکهەڵکێشی هەردووکیانن. کارەکتەر مرۆڤ بۆتەی چارەنووسی دەکات.

لە دوایین گرووپی شانۆنامەکانی شەکسپیردا کە ((گەرداوەکە)) یەکێکە لەوان خاڵێکی گرنگی جیاوازی بەدی دەکرێ. لە دراماکانی پێشوودا سزای تاوان و هەڵە شتێکی حەتمی بوو و کارەساتی کۆتایی شانۆنامەکان ئەو سزا بێ پەشیمانیانە تاوانباران و داروەدەستەکانیان پیشان دەدات، بەڵام لەو گرووپە شانۆنامەیەی دوایی گۆڕانێکی بەرچاو هەیە لە بیرکردنەوەی شەکسپیر وەك بڵێی وانەی مەسیحی بۆ لێبوردن وەرگرتووە و بەزەیی خودای بە تاونباراندا بیرهاتۆتەوە. ئەم هۆیەش بوو کە لە ((بەسەرهاتەکانی زستان)) پاشا کە زۆر نادادوەرانە خێزانە دڵسۆزەکەی دوورخستەوە، رێگەی پێ دراوە قەرەبووی ئەم هەڵەیە بکاتەوە و لێبوردنی خێزانەکەی وەدەست بهێنێ. هەورەها لە شانۆنامەی ((کامبیلین))دا (ئیماکیمۆ)ی پیلانگێڕ رێگەی تەوبەکردن و پەشیمان بوونەوەی پێ دراوە و سزاش نەدرا. ئەو قەناعەتە تازەیە لە هیچ شانۆنامەیەکی تر بە قەد لە ((گەرداوەکە)) بە روونی باس نەکراوە کە تێیدا لە دژیەکیەکی روونی چارەنووسی بێ بەزەیی بەپێی تێگەیشتنی کلاسیکی توند وەك لە تراژیدیاکاندا



وێنەی کێشراوە و خراوەتە سەر شانۆ، پرۆسپیرۆ لە هەموو دوژمنەکانی خۆی دەبوورێت بە وێنەی مەسیحییەکی پایەبەرز، بە جۆرێك (ئاریەل)ی نامرۆیی لە جیاتی ئەوان قسەدەکات، پرۆسپیرۆ خۆی ملکەچی هەندێ پرەنسیپی ئاینی دەکا و دەڵێ:

**(سەرەرای ئەوەی هەڵەکان و خراپەکانیان ئازاری زۆری دام**
**بەڵام بەهۆی ئەقڵی نایاب و دژ بە تووڕەییم بەشداری دەکەم.**
کارێکی تری دگمەن ئەوەیە کە من چاکەیان لەگەڵ دەکەم نەك
تۆڵە، کە ئەوان پەشیمانن تەنیا رێچکەی مەبەستم دەرکەوت.
چیتر گرژی نامێنێت

شەکسپیر تووڕەیی خۆی دژی نادادوەرییەکانی ژیان دەردەبرێت و لە دیدگەیەکی بەرزتر و پیرۆزترەوە سەیری شتەکان دەکا. دوایین دراماکانی خاڵێکی سەرەکی تێدا بە دێ دەکرێ کە ((لێبوردنە)) و بیرۆکەی سەرەکی ((ئاشت بوونە)) تێیاندا باڵا دەستە.

یەکێك لەلایەنە سەرنج راکێشەکانی تری شانۆنامەی ((گەرداوەکە)) بریتییە لە بوونی کەسایەتیی خواوەندەکانی وەك ((سیریس، ئیریس و هایمەن))، سەرەرای ئەوەی کە هیچ شتێك زیاد ناکەن بۆ رووداوەکان. ئەمەش بەوە روون دەکرێتەوە کە ئەلیزابێتییەکان حەزیان لە نمایشی مەزن و رەنگاو رەنگ و پیشاندانی دڵڕفێن بووە. لە سەردەمی شەکسپیردا جۆرێك درامای تازە بە ناوی ((دەمامکە- سەما)) بەربڵاو بوو بە کورتی ((دەمامکە- سەما)) بریتییە لە کورتە درامایەم کە کردارو نەخشەی کەم تێدایە و بە شێوەیەکی سەرەکی پشت بە نمایشی دڵڕفێن و جلوبەرگی جوان و گفتوگۆ دەبەستێ، درامای ((دەمامکە — سەما)) هاوشێوەی نمایشی مەزنە جگە لە بوونی هەندی کردار و گفتوگۆ. بە شێوەیەکی گشتی ئەو ((دەمامکە- سەما))یانە لە رۆژانی تایبەتدا نمایش دەکرا لە کۆشکی شاکان و ماڵی پیاو ماقووڵان. بن جۆنسۆنی کەڵەنووسەر زۆر لە درامای دەمامکە- سەمای نووسیوە بە بۆنەی ژنهێنان و یادی لە

دایك بوونی پیاوە ناودارەکان. مرۆڤی ئەو سەردەمەی ئینگلتەرە زانیارییەکی باشیان هەبوو لەسەر ئەدەب و زانیاریی گەلە کلاسیکییەکان و لاتینی و گریکی وەك زانینێکی پێویستی مرۆڤ سەیر دەکران. بێن جۆنسۆن ڕەخنەی لە شەکسپیر دەگرت، چونکە زۆر کەمی لە بارەی ئەو زەمانەوە دەزانی، بەڵام خواوەندە کلاسیکییەکان لەلای خەڵکی ئینگلیز ناسرابوون، ئەو خەڵکە ژۆپیتەر و ژونۆ، ڤینۆس، سیریس و ئیریس و ((هایمن)) یان دەناسی بۆیە لای شانۆنووس و شاعیران بایەخێکی زۆریان پێ دەدرا، بۆیە تەنانەت جۆن میلتۆن کە مەسیحییەکی ئۆرتۆدۆکسی بوو ئەو کەسایەتییە کلاسیکییانەی لەبەرهەمێکی بەناوی ((بەهەشتی دۆڕاو)) بەکارهێناوە، ئەوانە کەسایەتی ڕەمزی بوون کە لە زۆر دەمامکە-سەما درامای دیمەن جوان بەکار دەهاتن، چونکە جەماوەر ئەوانەی حەز پێدەکرد بۆیە سەیر نییە گەر شەکسپیر ئەمانەی بەکارهێنابێ بە مەبەستی ( پاراستنی چێژی جەماوەر) ئەو چێژە هەر لە سەرەتای پەیدابوونی شانۆوە کە دەکاتە درامای ئایینی بەرچاو دەکەوێ. بۆیە دەمامکە- سەما لە شانۆدا تەنیا بۆ هەمەجۆریی و دیمەنی جوان نمایش کردن بووە. هەندێ کەس لەوانە ئەڵمانییەکان پێیان وایە کە ئەم دەمامکە- سەمایە لە هەندێ لە ئاهەنگ وەرگیراون لە سکۆتلەندا کاتێ جەیمس پاشا ساڵی (١٥٩٤) بۆ ناولێنانی کوڕەکەی ئەنجامی دەدان، بەڵام بیرۆکە و نەخشە ئەو کات بڵاوو بوون و ئەو کارەکتەرانە زۆر بە شێوەیەکی رەمزی بەکارهاتوون. ڕەنگە شەکسپر ئاگادار بێ لە ((دەمامکە- سەمای هایمەن)ی جۆنسۆنی کە لە (١٦٠٦) دا نمایش کراوە کە هەمان نەخشە و کارەکتەر لە خۆوە دەگرێ. ئەو کاتە بەکارهێنانی نموونەیی و بەرهەمی ناودار زۆر باوبوو.

ئەگەر شانۆنامەی ((گەرداوەکە)) بە تایبەتی بە بۆنەی ژن هێنانی میر چارلس کە خاتوو ئەلیزابێتی بۆهێمیای هێناو ئەگەر بۆ ئەو مەبەستە بۆ یەکەم جار لە کۆشکی شاهانەیی نمایش کرابێ، ئەوا زۆر لە شتە نادیارەکانی ڕوون دەبنەوە. ئەمەش ڕێگەیەکی بە ناوبانگ بوو بۆ خۆشی بەخشین و ستایش بۆ شازادەکان و پیاو ماقووڵان. ئەگەر مەبەست لە نووسینی ((گەرداوەکە)) ئەمە بێ ئەوا دەمامکە- سەمایەکە بەشێکی گرنگی شانۆنامەکەیە بە لەبەر چاوگرتنی مەبەستی ویستراو. ئەو پیرۆزبایی و



خۆزگەی خۆش گوزەرانییانەی خواوەندەکان و سیرس و ئیریس و بە فێردیناند و مراندا دەڵێن ئاراستەی شازادەکان کراون، لەلای هەمووان وەك ستایشی دلسۆزانەی شەکسپیر بۆ چارڵس و ئەلیزابێت حیساب دەکرێن.

دوایین سەرنج سەبارەت بەم شانۆنامەیە بریتییە لە تایبەتمەندیی (خودنووسی) [ Autobiography ] کە شەکسپیر بەکاری هێناوە. شانۆنووس دەبێ شتی خودی باس نەکاو شەکسپیریش تێبینی ئەمەی کردووە هەرچەندە زۆر کەس هەوڵیان داوە ڕاڤەکردنی تاریکایی ماوەی تراژیدیا نووسینی شەکسپیر بگەڕێننەوە بۆ باری شانۆنووس خۆی لەو کاتەدا. لە دوا کۆمەڵەی بەرهەمەکانیدا بۆچوونێکی تازە بەدی دەکرێ لە نووسیندا کە باس لەیەکترگرتنەوەی پێوەندییە پچڕاوەکانی و تەنیایی و کەسانی دڵتەنگ بە هۆی دووری لە کەسانی خۆشەویست لەبەر لێکحاڵی نەبوونی و دووری لە وڵات دەکات. جێی بایەخە کە بزانین شەکسپیر چەندین ساڵی ژیانی لە لەندەن- دوور لە هاوسەرو منداڵەکانی لە ستراتفۆرد، بەسەربردووە. هەروەها دووبارە یەکی گرتۆتەوە لەگەڵیاندا کاتێ گەڕاوەتەوە ستراتفۆرد کە دەکاتە کاتی نووسینی دوایین شانۆنامەکانی ((کامبیلین)) و ((بەسەر هاتەکانی زستان)) و ((گەرداوەکە)). ئاخۆ گەڕانەوەی پرۆسپیرۆ بۆ میلان وەسفێکی مەجازییە بۆ گەرانەوەی شەکسپیر بۆ ستراتفۆرد ؟

مەجازێکی ڕاستەوخۆ و بە ئەنقەست لێرەدا هەبێ یان نەبێ ئەوا گومان لەو ڕاستییەدا نییە کە شەکسپیر لە شوێنێکی ترو بە شێوەیەکی تر ڕاستەوخۆ لەگەڵ جەماوەر دەدوێ و ماڵئاوایی لە جیهانی شانۆ دەکا کە وەك ساحیرێکی سەرەکی و پاشایەکی بێ هاوتا بۆ چەند ساڵێك حوکمی دەکرد. زۆر خێرا دەینووسی و خۆی زۆر ماندوو دەکرد بۆیە گومان نییە کە توانای نووسینی لە دەست دابێ، لەبەر ئەو فشارەی کە لەسەری بوو.

شەکسپیر دەیزانی کە ((گەرداوەکە)) دوایین شانۆنامەی دەبێ وە دەیزانی چیتر باسی گەردەلووکانی (لیر) و خۆشییەکانی (ئۆتێللۆ) ناکاو چیتر مردووەکان

زیندوو ناکاتەوە لە پاشاکانی ڕۆم و ئینگلتەرە بۆ ئەوەی لەبەردەم جەماوەری دەور ببینن. شەکسپیر بە پەشیمانییەوە دەڵێ:

**((لەسەر داوای من گۆڕەکان بوونەوە و نووستووانی ناویان بە ئاگا**
**هێناو هاتنە دەرەوە بە هۆی هونەری بەهێزی من، بەڵام لێرەدا ئەو سیحرە**
**ڕیسوا دەکەم کاتی داوای مۆسیقایەکی ئاسمانی دەکەم...**

ستافی خۆم تێکدەشکێنم و لە قووڵایی خاك دەینێژم. لە قووڵاییەك کە پێشتر دەنگی شاقووڵی نەگەیشتووتێ کتێبەکانم دەخنکێنم))

دەبێ ئەو بەشەی شانۆنامەکە لەبەر ڕۆشنایی ئەم ڕاستییەیانەدا ڕاڤە بکرێ، چونکە گومان لەوەدا نییە کە ئەو کاتەش شانۆنووس پرۆسپیرۆیە و وشەکانی واتایەکی تر دەبەخشن کە ماڵئاوایی کۆتاییە لە جەماوەری ئینگلیز کە بۆ ماوەیەکی درێژ بۆ لای خۆی کێش کردبوو بە هۆی هونەرەکەیەوە. پرۆسپێرۆ دەتوانرێ وەك وێنەیەکی ڕەمزی کەسایەتیی شەکسپیر خۆی دابنرێت کاتێ گەیشتە دڵنیایی و پێگەشتوویی ژیریی ئەو سەردەمە.

تایبەتمەندییەکی تری ((گەرداوەکە)) بریتییە لە بەکارهێنانی درامیی گۆرانی لەلایەن شەکسپیرەوە. لە ((گەرداوەکە)) دا مۆسیقا کەرەستەیەکی باڵا دەستە، چونکە ((کالیبان)) دەڵێ:

**((ئەو دوورگەیە پڕە لە دەنگە دەنگ**
**چەند دەنگێك کە خۆشی دەبەخشن و ئازار نادەن))**

شەکسپیر سەرکەوتنێکی گەورەی لە (( گەرداوەکە)) بە دەست هێنا لە ڕووی بەکارهێنانی مۆسیقا وەك ڕێگەیەك بۆ پەردە لادانی درامیی لەسەر کەسایەتییەکان. گۆرانییەکان گونجاون لەگەڵ کارەکتەرەکان، چونکە بە شێوەیەکی درامی لە ڕێگەی گۆرانییەکانەوە وێنەی خۆیان دەکێشن. گۆرانییەکانی ( ئاریەل) خۆش و دڵگیر و خۆش ئاواز و جوانیان تێدا بەدی دەکرێ. گۆرانییەکانی ( کالیبان) گوزارشت لە سروشتێکی چۆڵ و چڕ دەکەن.ئەو گۆرانییانە ڕقی ناپاك و



خۆشیی بێ بنی مرۆڤی سەرەتایی پێوە دیارە. لە کاتێکدا گۆرانییەکانی (ستیڤانۆ) نۆتەیەکی مرۆیی و کرداریی تێدا بەرچاو دەکەوێ.

ڕاستە ئەو هەموو شتانە لە ((گەرداوەکە)) ی شەکسپیردا بەدی دەکرێ، بەڵام ئەوەی جێی سەرنجە بریتییە لە تێکهەڵکێشانی ئەوانە بە مەبەستی پێکهێنانی یەکیەتییەکی درامیی کە لە شانۆنامەکەدا نمایش کراوە. لێکۆڵەرەکان دەتوانن خۆشی لە دابەش کردنی شانۆنامەکە وەرگرن بۆ پێکهاتە سەرەکییەکانی و شیکردنەوەیان. هەروەها خوێنەری ئاسایی دڵخۆش دەبێ بەو گونجان و ئاوازانەی لە شانۆنامەکەدا لە ڕێگای خۆشی بەخشین و داهێنان دروست بوون. ئەمەش بەرزترین پێوەری دراماییە و لێرەدا شەکسپیر سەرکەوتنێکی تەواوی بەدەست هێناوە.

**سەرچاوە:کتێبی**

The Tempest: Introduction.
PP(٤٦-٥٥)

# کۆمپیوتەرو... شانۆنامەیەکی شەکسپیر

بێ گومان شەکسپیر ئەو کەڵە نووسەرەیە کە بەڕای من کەس نەگەیشتۆتە پایەی ئەو. لە هەر سەدەیەك، هەر لە ساڵانی نمایش کردن و دواتریش چاپ کردنی بەرهەمەکانی، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە شوێنی جیاجیاوە گفتوگۆ لەسەر بەرهەمەکانی بەردەوامەو هەرجارەی شتێکی نوێ لە نێو بەرهەمەکانی دەدۆزنەوە کە هەموویان گەورەیی و بلیمەتی ئەو نووسەرە پیشان دەدەن.

ئاشکرایە شەکسپیر هیچ گرنگییەکی بە کۆکردنەوەو چاپکردنی بەرهەمەکانی نەداوە چونکە دەیگوت ئەگەر بێتو بەرهەمەکانم شایانی چاپکردن بن ئەنجامیان باش بێ ئەوا خەڵکی و هاوڕێکانم کۆیان دەکەنەوە و چاپیان دەکەن. بۆیە دەبینین تا ئێستا تێکرای بەرهەمەکانی بە نادیاری ماوەتەوە. ئەوەی ناکۆکی لەسەر نییە شەکسپیر (٣٦) شانۆنامەو (١٥٤) سۆناتە و (٢) هۆنراوەی درێژی نووسیوە، بەڵام لە ساڵی ١٦٦٤، واتە پاش ٤٨ ساڵ دوای مردنی شەکسپیر، شانۆنامەی (پیرەکلز Pericles) بە بەڵگەی سەلمێنەر کرا بە موڵکی شەکسپیر.

لە ساڵی (١٩١٦) بۆ یەکەم جار (ئیدوار دوماند تۆمبسن) ئەوەی ئاشکرا کرد کە بەلایەنی کەم بەشێك لە شانۆنامەی (تۆماس مۆر) لەلایەن شەکسپیرەوە نووسراوە. ئەم شانۆنامەیە دەست نووسەو بە چەند خەتێکی جیاواز نووسراوەتەوە. ئێستا لە مۆزەخانەی بەریتانیایە، دەبێ ئەوەش لەیاد نەکەین کە ئەم شانۆگەرییە کاتی خۆی لەبەر چەند هۆیەکی سیاسی ڕێگەی پێ نەدراوە نمایش بکرێت.

خاوەنێتی ئەم شانۆنامەیە ماوەیەکی زۆر گفتۆگۆی لەسەر کراوە لە سەرەتادا بە مولْکی ( ئەنتۆنی موندی و هێزی چێتل و چەند نووسەرێکی تر) دادەنرا، تا ساڵی ١٩١٦ کاتێ تۆمبسن ئەو ڕایەی خۆی ئاشکرا کرد، بەڵگەی سەرەکی (تۆمبسن)یش بۆ ئەو ڕایە بوونی خەتی شەکسپیر بوو لە ناودەستووسەکەدا، بەشێکی شانۆنامەکە بە خەتی شەکسپیر نووسراوەتەوە ئەم ڕایەش لەلایەن چەند کەسانێك پشتگیری لێ کراو چەند کەسانێکیش پشتگوێیان خست.

ڕێگەی شیکردنەوە شێوازی (Stylistic Analysis) کە ڕێگەیەکی زۆر ئاڵۆزەو بەهۆیەوە بە وردی و بە تەواوی نووسینەکانی نووسەرێك لە نێو کۆمەڵە نووسەرێك دەناسرێتەوە، سەلماندی کە نەك تەنها بەشێك بەڵکو هەموو شانۆنامەکە لەلایەن شەکسپیرەوە نووسراوە. ئەگەر ئەمەش پەسەند بکرێ ئەوا (تۆماس مۆر) دەبێتە دووەم شانۆنامە کە بۆ سەرجەم بەرهەمەکانی شەکسپیر زیاد دەکرێ.

(تۆماس مریام) کە مامۆستایەکی زانکۆی ( ئایدنبیێرگ)ە ئەم دۆزینەوەیەی ئاشکرا کردووە پاش ئەوەی دیراسەی تێکستی شانۆنامەکەی کردووە بە هۆی بەکارهێنانی ڕێگەی شیکردنەوەی شێوازی کە لەلایەن بەشی زانستەکانی کۆمپیوتەر لە زانکۆی ئایدنبیێرگ داهێنراوە. ئەم ڕێگەیە نەریتە شێوازێکی نائاگایانەی جێگیر لە بەرهەمەکانی نووسەرێك دیاردەکات کە لاسایی کردنەوەی سەرکەوتوانەی ئاسان نەبێت. ئەم (نەریتە وشانە)ش چەند شتێك دەگرێتەوە وەك ئەو ئامرازو وشانەی بۆ بەیەکەوە بەستنەوەی بەشەکانی بەکاردێن وەکو (tobe، in the، of course، if، as ) کە ئەمانە ڕێژەی بەکارهێنانیان لە نووسەرێکەوە بۆ نووسەرێکی تر جیاوازە، یەکێکی تر لەم نەریتە وشانە ئارەزووی دەست پێکردنی ڕستەیە بە چەند وشەو ئامرازێکی ئاسایی وەکو (but،in ، a، and،the ) شیکردنەوەکەش بەم شێوەیە دەبێ هەموو تێکستەکە دەخرێتە ناو کۆمپیوتەرێکەوە کەوا بەرنامەرێژکراوە و نەریتە وشەی ویستراو هەڵبژێرێت.

مەبەست لەم لێکۆڵینەوانەش وەدەست هێنانی جۆرە (جێ پەنچەیەکی ئەدەبی) (Literary Fingerprint) ئەوتۆیە بە هیچ شێوەیەك ساختە نەکرێت. هەندێك لەم لێکۆڵەرەوانە دەڵێن ناتوانین ئەم نەریتە وشانە بە پێوەری شێوازی نووسەران



دەبنێین، هەرچی بەشەکەی تری ئەم لێکۆڵەرەوانەن لەو باوەڕەدان کە ئەگەر بێتو ئەو نەریتە وشانە بە وردی و بەچاکی دیراسە بکرێن ئەوا هیچ بوارێك بۆ تێکەڵ بوونی نووسینەکانی دوو نووسەری جیاواز نامێنێتەوە. داهێنان و دۆزینەوەی ئەم ڕێگەیە لەلایەن (ئەندرۆ مۆرتن، سیدنی میچلسن و نیل هاملتن) لە زانکۆی ئایدنبیێرگ بۆ یەکەم جار لە ژمارەیەك لە ژمارەکانی (The Observer)ی ساڵی ١٩٧٦، لە بابەتێکی سەربەخۆدا بە تەواوی وەسف کرا.

تۆماس مریام، مامۆستایەکی ئەم زانکۆیە، ئەمەی خوێندەوە و زانیاری زیاتری لە هاوەڵەکانی لە زانکۆ لەسەر ئەم ڕێگەیە پەیدا کرد. دواتریش دەستی کرد بە بەکارهێنانی ئەم ڕێگەیە لە لێکۆلینەوەکانی داو ئەنجامەکەشی دۆزینەوەی شانۆنامەیەك بوو بۆ شەکسپیر.

تۆماس مریام یەکەم جار تێکستەکەی شیکردەوە بۆ شارەزابوونی لە (یەکگرتوویی ناوەکی) (Internal consisteny). دەبێ ئەوەش بڵێین کە لەو کاتەدا مریام ئاگاداری ڕایەکەی ئیدوارد تۆمبسن بوو. شانۆنامەیەك ئەگەر هەر بەشی لەلایەن نووسەرێکەوە نووسرا بێ وەك شانۆنامەی (تۆماس مۆر) ئەوا بەلایەنی کەم دەبێ چەند جیاوازییەك بەدی بکرێ سەبارەت بە نەریتە وشە، کەچی لە بەشەکانی ئەم شانۆنامەیەدا هیچ جیاوازییەك لە نەریتە وشەی بەکارهاتوو بەدی ناکرێت، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە تەنها نووسەرێك ئەم شانۆنامەیەی نووسیوە، بۆیە گەر شەکسپیر بەشێکی نووسیبێ ئەوا هیچ گومان لەوەدا نییە کە هەموو شانۆنامەکە لەلایەن شەکسپیرەوە نووسراوە.

لەکاتی بڵاوبوونەوەی ئەم ڕێگە تازە داهێنراوە، دکتۆر مۆرتن لە زانکۆی ئایدنبیێرگ ماوەیەکی کەم بوو شیکردنەوەکانی هەر سێ شانۆنامەی (یۆلیۆس قەیسەر)، (پیرەکلن) و (تیتۆس ئەندرنیکۆس)ی بڵاوکردبووەوە. تۆماس مریام بە سوود وەرگرتن لە شیکردنەوەکانی دکتۆر مۆرتن، هەڵسا ٤١ نەریتە وشەی لەم سێ شانۆنامەیەدا لەگەڵ نەریتە وشەکانی شانۆنامەی (تۆماس مۆر) بەراورد کرد، لەم ٤١

نەریتە وشە بەراوردکراوانەدا لە سێ شانۆنامەکەی پێشوو تەنها یەك نەریتە وشە جیاوازی هەبوو لەگەڵ نەریتە وشەکانی (تۆماس مۆر). بەم شێوەیە تۆماس مریام بۆی دەرکەوت کە هیچ بەڵگەیەك بە دەستەوە نییە کە جیاوازی نووسەرێتی ئەم چوار شانۆنامەیە بسەلمێنێ. لە دواییدا مریام وتی ئێستا من دەتوانم بڵێم کە شانۆنامەی (تۆماس مۆر) بە تەنها لەلایەن شەکسپیر نووسراوە. ئێستا کۆمەڵێك لێکۆڵینەوە لە زانکۆی ئایدنبێرگ ئەم کارەی تۆماس مریام دووبارە دەکەنەوە بەڵام ئەمجارەیان بە بەکارهێنانی چەند کۆمپیوتەرێکی پێشکەوتووتر و چەند تاقیکردنەوەیەکی تر بۆ دۆزینەوەی چەند بەڵگەیەکی تر بۆ پشتگیری کردنی ئەنجامەکەی تۆماس مریام.

دکتۆر مۆرتن پێشبینی ئەوە دەکا کە پاش سەلماندنی تەواوی ئەم ئەنجامە، ئەم ڕێگەیە لەلایەن زۆر لە لێکۆڵەرەوان بەکاردێ، بەوانەشەوە کە پێشتر بەکارهێنانی ڕێگەی شیکردنەوەی شێوازیان بە چاك زانیوە. زۆر لە لێکۆڵەرەوەکانی لم باوەڕەدان کە شانۆنامەی ( تۆماس مۆر) لە ساڵی **١٥٩٣** ز نووسرا بێ، هەر لە کاتی نووسینی شانۆنامەکانی ( تیتۆس ئەندرنیکۆس) و ( کۆمیدیای هەڵەکان). تۆماس مریام بە بەکارهێنانی ڕێگەیەکی جیاواز لە شیکردنەوەی شێوازی گەیشتە هەمان مێژوو واتە (١٥٩٣).

لە کۆتایی دا پێویستە ئاماژە بۆ ئەوەش بکەین کە شانۆنامەی (تۆماس مۆر) وەك شانۆنامەکانی تری شەکسپیر (شانۆ- لەناو- شانۆ)ی تێدا بەدی دەکرێ لەگەڵ چەندین شوێن پەنچەی تری شەکسپیر.

**سەرچاوە**


The Observer، ١٩٨٠